# دیوانی ناڵه حەسەن

بەرگی دووەم - ۲۰۰۹ - ۲۰۲۱


● بابەت: شیعر

● نووسینی: ناڵه حەسەن

● دیزاین: ئاکار جەلیل

● چاپ: یەکەم/ ۲۰۲۱

● تیراژ: ۱۰۰۰ دانه

● نرخ: ۵۰۰۰ دینار

● چاپخانه: چاپخانەی تاران/ تاران

له بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانه گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (    )ی ساڵی ۲۰۲۱ی دراوەتێ

# خەون و مەرگی شاعیرێکی تەنیا

چاوەکانت لەسەر یەک دابنێ
تا پڕ دەبیت
له ڕووناکیه شینەکانی شەو
له زەردەخەنه سپیەکانی گوڵ
له خەیاڵه لیمۆییەکانی تەنیایی
له مۆری و مەرجانه کریستاڵییەکانی ئەڤینی
چاوەکانت لەسەر یەک دابنێ
تا خەون بینین
خەون به فڕینەوه ببینه
خەون به باخچەی ئارەزووەکانت و
به ئایندەی خۆتەوە ببینه

چاوەکانت مەکەرەوە
تا پێڵووی چاوەکانت
داو داوی برژانگەکانت
تێکەڵ بە سەوزایی با دەبن
تێکەڵ بە خۆرەتاوی گیا دەبن
تا لەدوای نیوەڕۆیەکی بەهار
خۆت لە نێو شەقامەکانی بەفر دەبینیەوە
چاوەکانت لەسەر یەک دابنێ
هەر خەون ببینە خەون
تا دەبیت
بە پەیکەرێک لە ئاگر
بە تابلۆیەک لە تریفە
هەموو وەرزەکان و سەدەکان و
شەوەکانی نێو ڕۆحە تاریکەکەت
ڕووناک دەکەیتەوە

چاوەکانت لەسەر یەک دابنێ
دەستەکانت بێنە و با بڕۆین
بەرەو منداڵێتی خەیاڵ
بەرەو منداڵێتی خەون
با بڕۆین بەرەو نیشتیمانێکی نادیار
بە دیار مەرگی شاعیرێکی تەنیا
یەکەمین ئایەتی ڕاز بخوێنینەوە و
یەکەمین پێک لە شەڕابی موحیبەت هەڵبدەین
چاوەکانت لەسەر یەک دابنێ و
با بڕۆین
لە نێو پایزی ئاو
بە دیار مەرگی شاعیرێکی تەنیا
سەما بکەین
سەما بکەین و خەون ببینین
بە دیار جەستەی ئەو شاعیرەی

لە یەکەمین نیگاوە تا مەرگ
لە هەڵوەرینی یەکەمین گەڵاوە تا غوربەت
لە سەرخۆشبوونی یەکەمین شەپۆلەوە تا بێهوودەیی
نەیدەهێشت
خۆر لە کۆڵانی خەونەکانمان ئاوا بێت و
باڵندەی نێو قەفەزەکانیش بە برسێتی بمرن
نەیدەهێشت
ماسیە بچکۆڵەکانی دەریا و
هەوێردە هێمنەکانی هەور
گەردنی مردن ماچ بکەن
چاوەکانت مەکەرەوە و با بڕۆین
لەنێو پایزی ئاوەدانی
بەدیار دەلاقە گەورەکانی بەهەشت
چاو بە کتێبە ڕەنگ زەیتونییەکاندا بخشێنین
یەکەمین کتێبی عەشق بخوێنینەوە

ئەو کتێبەش
کە باس /
لە تیربارانکردنی یەکەمین ئەستێرەی سۆزانی دەکات
یان چیرۆکی /
ئەو کچۆڵەیەی کە لەسەر نامەیەکی خۆشەویستی
لەنێو زیندانە ئەبەدیەکەی ڕەشەبا
ڕۆشنایی نەبینیەوە
یان بەسەرهاتی /
ئەو گوڵاڵە سوورەیەی
کە تا سیسبوون و هەڵوەرین
شەرمی کرد دەمی بخاتە نێو دەمی پەپوولەیەک
چاوەکانت لەسەر یەک دابنێ
تا چاوی خەونەکانت شین شین هەڵدەگەڕێن
شین شین شین
وەک پەیکەرە شینەکانی ئاو

وەک ئەدگارە ئیرۆسییەکەی ئاسمان
چاوەکانت مەکەرەوە
تا دەبیت بە قامکێک بخوور
تێکەڵ بە هەناسە شینەکانی ژیان دەبیت
تێکەڵ بە زەمەنە زێڕینییەکانی زریان دەبیت
چاوەکانت با لەسەر یەک بن
تا سۆتەکەی جگەرەی سەر لێوی خەونەکانت
دار و درەختی دنیایەکی تر و
پەردەی پەنجەرەکانی بەهەشتێکی تر
ڕەنگ دەکات
چاوەکانت مەکەرەوە و با بڕۆین
لەنێو پایزی هەتاو
لەژێر کەپرێکی ڕەنگاوڕەنگ
بەدیار مەرگی شاعیرێکی تەنیا
خەون ببینین

خەون خەون خەون
خۆمان بخزێنینە نێو خەونەکان و
نێو یەکەمین دیوانە شیعرییەکەی ئەم شاعیرە
لەوێدا /
لەنێو نیشتیمانە شلێرییەکەی شەبەنگ ادا
بەدوای گەڕەکە شینەکانی شادومانی و
بەدوای کاتژمێرە سپیەکانی سپیدە و
بەدوای نەورەسە بێنەواکانی عەشق دا / بگەڕێین
هەر لەوێدا
بەدیار مەرگی ئەم شاعیرە تەنیایەدا
بەدەم خوێندنەوەی
یەکەمین قەسیدەی عەشق
یەکەمین نیگاو لەنجەولارە تەڕەکانی باران
بەدەم ڕەنگکردنەوەی
یەکەمین نیگارە ناسکەکانی نامورادی

بەدەم گوێگرتن
لە یەکەمین سەمفۆنیای ژیان
لەنێو /
یەکەمین خەڵوەتگەی خەونێکی ئەرخەوانی
چاوەکانمان بکەینەوە ... !

**کۆتایی دیسەمبەری ٢٠٠٩**

# تکایەک لە حزوری مەریەمێکی خودا

## ١

با وەک جاران
گەردێکی گیایی بم
لەسەر گەردانە گەوهەرییەکەی
سەر گەردنت
گەرد گەرد
ڕاز و نیاز و
گەردیلەی ئۆمێدەکانم بخوێنەوە
گاف گاڤیش
پیاسە و وڕێنە و

خه‌ون و هاواره‌کانم شیکه‌ره‌وه‌
به‌ میهره‌بانی و گه‌وره‌ییت بم به‌خشه‌
به‌ جوانییه‌کانی خۆشت گه‌ردنم ئازاد که‌
له‌نێو ڕه‌نگ و گه‌رمایی له‌شی خۆت بمهێڵه‌وه‌
بم به‌خشه‌ و گه‌ردنم ئازاد که‌ گوڵم
که‌ بێویستی خۆم به‌ جێم هێشتی و
ڕه‌نگه‌ تا ئه‌به‌د نه‌تبینمه‌وه‌ ... !

## ٢

ئەی بەیاتریسی
نێو بەهەشتە غوربەتییەکەی عەشق
نازانم تۆ دڵیشم ئازاد دەکەیت
کە هەموو تەمەنی خۆم

لەنێو ژوورەکانیدا بەندم کردبووی
لە سەر باڵەکانی ئومێد و
لەنێو ئامێزم هەڵم گرتبووی
هەموو ئاسمان و دەریاچەکانم پێکردبووی
لەنێو نیگار و تابلۆیەکانی خەیاڵیشم
هەمیشە
فیگەرەکانی شێوە و ڕوخسارتم دەگۆڕی
قژی خاوتم
بە هەموو ڕەنگێک ڕەنگ دەکرد
دەمێک ڕەش ڕەش
لە بەخت و چارەنووسم / گەلێک ڕەشتر
دەمێک سپی سپی
لە خەم و خەونەکانم / گەلێک سپیتر
ڕوخسارێکی دیاری کراوت نەبوو
بێ ئەندازە ئەفسووناوی و سەراسیمە

دەمێک لە مەریەمێکی خوا دەچووی
بەڵام گەلێک
ڕەنگ نیان و چاو بەخومار و شەدەلارتر
دەمێکیش لە کچە کافرۆشێکی جوان دەچووی
بەڵام گەلێک
باڵا زراڤ و مەمک قنج و شۆخ و شەنگتر
هەندێکجاریش
لەنێو بادا /
بە تەنیشتمەوە پیاسەت دەکرد
بوخچەی حەز و خۆزگەکانت بۆم هەڵدەگرت
یان لەنێو ئاو
هەمیشە بە دوامەوە بووی
کە دەستەکانت دەخستە نێو دەستم
هەموو دەمارەکانی جەستەم
لەگەڵ ڕووناکیەکانی جوانی تۆ / هاواریان دەکرد

یان ئەو شەوانەی
بە چرپەوە پێت دەگوتم
چ مانگە شەوێکە ئەمشەو
لەشم شیلەی شادومانی لێدەچۆڕێ
بەم قسانەت دڵی خاڵخاڵۆکەکانی خەیاڵم
بە غەمزەوە خورپەیان دەکرد
ئەو دەمانەش کە بە نیگایەک سەیرت دەکردم
منیش هەموو
خونچە لێو بەخەندەکان و
هەموو جوانیەکانی ژیانم
لەنێو گلێنەی چاوەکانتم بەدیدەکرد
یان ئەو دەمانەی
لە ئامێزی مانگ ڕادەکشایت
بەشێک لە زەردی زەردەخەنەکانی خۆت
بە من و خاک و

بە ڕووناکیە زێڕینیەکانی خۆرەتاو دەبەخشی
دەزانم
تۆ لە هەموو شوێنێکیت گوڵم
لە دوورترین دوورگەکانی دڵی من
لە قووڵترین قووڵاییەکانی قەدەری من
لە تروسکاییترین تاراوگەکانی تەمەنی من

## ٣

ئاخر گوڵم
خودا بەم هەموو هەوری زامەوە
بەم هەموو تۆفان و تاڵاوی تەنیاییەوە
هەرگیز فرمێسکەکانی
هێندەی / فرمێسکەکانی تۆ
پڕ حەسرەت نەبوون

گیا بەم هەموو شەونمەوە
بەم هەموو ناسکی و لەنجەی جوانییەوە
هەرگیز جەستەو مەمکۆڵەکانی
هێندەی / جەستە و مەمکۆڵەکانی تۆ
پڕ شەهوەت نەبوون
خاک بەم هەموو
بەفر و کانیاو و ڕووبارانەوە
بەم هەموو مێرگ و غوزار و بێستانانەوە
هەرگیز سەما و زیکرەکانی
هێندەی / سەماو زیکرەکانی تۆ
ئاگری نەبوون
ئەی فریشتە
ڕەنگ ئاوریشمییەکەی عەشق
لەو ڕۆژەوەی

ئاوی زەمزەمی ئارەزووەکانی خۆت
ڕژاندۆتە نێو
جۆگە ڕۆخ شەقاربووەکانی ناخی من
لەو ڕۆژەوە
تۆ ماڵێکت هەیە
له نێو گەڕەگە گەرمەکانی عەشق و
ماڵێکیش لەنێو کۆڵانە پایزییە
غەریبیەکانی نێو غەریزەکانی من
شەوێک له پەنجەرەی بروسکەوە
له نووری تەنوورەکانی تەنیاییم دەڕوانی
شەوێکیش
لەنێو خەونە ئیرۆسییە ئاورینگییەکانم
دەبیە میوانی من

گوڵە گیان
نازانم پەنجەکانیشم ئازاد دەکەی ... ؟
کە هەمیشە
سەرتاپای جەستە و
هەموو برینە بەسۆیەکانتی ئارام دەکردەوە
دەزانم ئێستا
تۆ لە دوورترین نیشتمانەکانی خەیاڵ و
لە دوورترین ئۆقیانووسەکانی خەون دای
بەڵام ئەی بەیاتریسە ڕەشپۆشەکە !
تۆ تا ئەو چرکەیەش
تا ئەو دەمەو نوێژی عەشقەش
هەر بەشێکی
لە ڕەنگی پێست و لە فێنکی هەناسە و
لە تەڕێتی
باخچە و سنەوبەر و ڕەشەڕەیحانەکانی ڕۆحی من

تۆ /
هەمیشە و هەمیشە و هەمیشە
هەر لە گەڵم دای
هەمیشە و هەمیشە و هەمیشە
هەر / دار هەنارێکی پڕ لە پشکۆکانی هیوای
هەمیشە و هەمیشە و هەمیشە
هەر / لە ماڵپەڕە عەبەسییەکانی دڵم
لەنێو ئەلبوومی دیوانە شیعریەکانم
ڕووت ڕووت دەبیەوە
نێو لەپی وشەکانم دەخوێنیەوە و
گۆنا و کوڵمە سوورەکانیان ماچ دەکەی
ئیدی تەنها تکایەک گوڵی من
لێرە بەدوا
نامەکانم بدە دەم با
کۆد و هێماکانیشیان ئازاد کە

بۆ هەموو نەوەکانی عەشق و
بۆ هەموو پەیامبەرەکان و
سروشت و خوا
بە گەورەیی و جوانیەکانی خۆت بم بەخشە
لەنێو بالکۆنەکانی ڕۆحی خۆت بم هێڵەوە
بم بەخشە و گەردنم ئازاد کە گوڵم
کە بێویستی خۆم بە جێمهێشتی
ڕەنگە تا ئەبەد نەتبینمەوە ... !

**ئۆکتۆبەری ٢٠٠٠**

# ژنەکان بوونەوە ئاو

ژنەکان لە جنسی باران بوون
هاتبوون
تا ڕۆحی پڕ لە برینی عاشقەکان
سارێژ بکەن و
لێوی گەڵایە وشکهەڵاتووەکانیش
تەڕ بکەنەوە
هاتبوون
تا عاشقەکان فێری زمانی باران بکەن
وەرزەکانمان پڕ بکەن لە ڕووناکی و
شەوە شەرمناوییەکانمان پڕ لە شەونم و
خەونەکانیشمان پڕ لە ئەستێرەی سپی

هاتبوون
تا گەڕەکە هەژارنشینەکانی عەشق
ئاوەدان بکەنەوە
ماڵەکانمان پڕ بکەن لە بخوور و
شەقامەکانیشمان پڕ لە نوور
ئەوان کە هاتن
لە باکووری هەورە سپییەکانەوە
دەرکەوتن
بە نێو ڕۆحی تەمە سپییەکانەوە
ڕەت ببوون
ئەوان کە هاتن
لە سەر پشتی ماینە سپییەکانەوە
زەردەخەنەکانیان
هاڵاوی لێهەڵدەستا

ژنەکان کە گەیشتنەلامان
پەیامە سپیەکانی عەشقیان
بۆمان خوێندەوە
چیرۆکە ئیرۆسییەکانیان
بۆمان گێڕایەوە
ژنەکان کە گەیشتنەلامان
هەمووومان بەیەکەوە
پێکێک لە شەڕابی عەشقمان هەڵدا
لە پێشوازییان
چەماینەوە و
نەرم نەرم سەمامان بۆ کردن
ئەوانیش
هەریەکە و گوڵێکی سپییان
پێ بەخشین و
تا شەودرەنگانیش لە گەڵمان مانەوە

ژنەکان بەر لەوەی بڕۆنەوە
کتێبە پیرۆزەکانی عەشقیان
بەسەر ماڵەکانمان دابەشکرد
کۆڵان و باخچە و شەقامەکانیان
عەتر ڕێژکرد
ژنەکان ڕۆیشتنەوە و بوونەوە ئاو
ئێمەیان
لە ئامێزی خەونە سپیەکان و
لە نێو مەمکۆڵەی
هەورە سپیەکانەوە جێهێشت
ژنەکان نەشمیل و نەرم و نیان بوون
وەک پەیکەرێکی ئاوریشمین
ڕەنگاوڕەنگ و درەخشان بوون
وەک خاڵخاڵۆکەکانی بەهەشت
ژنەکان بە نەرمی دەدوان

لەکاتی ئاوێزانبوونیش
بە نەرمی چاوەکانیان لە سەریەک دادەنا
وەک ئەوەی لە خەوێکی ئەبەدی دابن
وەک ئەوەی
بە نێو خەونەکانی خۆیان بمانگێڕن
ژنەکان بەرلەوەی بڕۆنەوە
پێیان گوتین
جارێکی تریش دێینەوە
ئەمجارەیان کە هاتنەوە
ئەفسانەی
تەنیایی مانگمان بۆ دەگێڕنەوە
باسی فەنتازیای جوانییەکانی
پایزمان بۆ دەکەن
هەریەکە و ئەسپێکی حدودی

لە جنسی بروسکەمان بۆ دێنن
ژنەکان تێکەڵ بە ئۆقیانووسەکان بوونەوە
گەڕانەوە نێو
دوورگە سەوزەکانی ئاو
بۆ نێو ماڵە ئەبەدیەکەی عەشق
ئای ژنەکان چەندە جوان بوون
ئێمەش لە چاوەڕوانیان
لە باڵکۆنەکانی تەنیایی
ئایەتە پیرۆزەکانی عەشق دەخوێنین
بەڵکو ئەوە خوایە
ژنەکان زوو بگەڕێنەوە ...!

**ناوەڕاستی تەمموزی ٢٠١٠**

# دەرگاکانی گەردوونم بەڕوودادەخەن

دەرگای بەهەشتم بەڕوو دادەخەن
من لە نێو شیعرەکانم
بەدوای ژیان دا دەگەڕێم

دەرگای بەهارم بەڕوو دادەخەن
من لێوانلێوم لە جوانیەکانی پایز

دەرگای ڕووناکیم بەڕوو دادەخەن
من لە جنسی تاریکیم
لەنێو هەناسەکانی شەودا دەژیم

دەرگای زیندانم بەڕوو داخەن
لەنێو ژوورەکانی نەزانین قۆڵبەستم کەن
من لەنێو خەونەکانم
بەدوای ئازادی دا دەگەڕێم

دەرگای دۆزەخم بەڕوو داخەن
لەنێو بورکان و ئاگردانەکانی ئەوێ با بسووتێم
من خۆم پەیکەرێکم لە بورکان و ئاگردانی عەشق

دەرگای گەڕانەوەم بەڕوو داخەن
من هەموو شەوێک
لەنێو مەمکۆڵەکانی نیشتیمانم دەخەوم

دەرگاکانی کەنیسە و مزگەوت و پەرستگەکانم بەڕوو داخەن
من موریدێکی هەڵاتووی نێو تەکیە و خانەقاکانم

دەرگای ئەمرۆم بەڕوو داخەن
من لەنێو کازێوەی سبەینێوە
لێوە نارنجیەکانی سپیدە ماچ دەکەم

دەرگاکانی سەدەکان و سبەینێشم بەڕوو داخەن
من لەنێو خۆرەتاوی ئەبەدیەت دا
جاویدانە سەما دەکەم

دەرگای کۆشکەکانی
پاشا و گەدا و کوێخاکانم بەڕووداخەن
من کوڕە هەژارێکم
پێلاوە لاستیکە دڕاوەکانی باوکم
قەت لەبیر ناکەم

دەرگای گۆڕستانم بەڕووداخەن
لەنێو گۆڕە تاریکەکاندا بەندم کەن
من کولیکە سوورێکی چاوگەشم
ڕۆشنایی چاوەکانی خۆم بە مردن دەبەخشم

دەرگاکانی تیاترۆخانە و سەماخانەکانم بەڕوو داخەن
من لەنێو بوخچەی غەریزەکانی ژنێکی پاکیزەوە
لاوکەکانی تەنیایی خۆم دەنووسمەوە

دەرگای ئاسمانم بەڕوو داخەن
من ڕەنگە سەوزەکەی نێو جەستەی گیام
برین و خەمەکانی خاک دەلاوێنمەوە

دەرگای بیابانم بەڕوو داخەن
من ئەشقیایەکی سەرمەدیم
لەنێو ئەشکەوتەکانی ئەستێرە
ئایەتەکانی عەشق دەخوێنمەوە

دەرگای مێژووم بەڕوو داخەن
من لەنێو دەفتەرەکانی ئاو
ڕووداوەکان و جەنگەکان و یاداشتنامەکانی
گەردەلوول و بروسکە و خۆرەتاو
دەنووسمەوە

دەرگای ڕەشەبام بەڕوو داخەن
من شنەبایەکی کۆچەریم .
لە باکووری ڕووبەرێکی نادیارەوە

خونچە بریندارەکانی نێو ڕۆحی
کچە عاشقێکی ناموراد
دەگەشێنمەوە

## ٢

دەرگای بەهەشتم بەڕوودادەخەن
هەموو بەهەشتەکان
نەیانتوانی
دار سێوێک یان هەنارێک
دار خۆخێک یان هەنجیرێک
دار لیمۆیەک یان هێشوەترێیەکی
وشکهەڵاتووی نێو ئارەزووە ئیرۆسییەکانم
ببوژێننەوە

دەرگای بەهارم بەڕوو داخەن
هەموو بەهارەکان
نەیانتوانی
زەردەخەنە مۆنالیزاییەکەی
سەر ڕوخساری منداڵیم
بخوێننەوە

دەرگای ڕووناکیم بەڕوو داخەن
هەموو ڕووناکییەکان
نەیانتوانی
باریکە ڕێیەک یان دەلاقەیەکی
نێو مەملەکەتی تاریکی
ڕووناک بکەنەوە

دەرگای زیندانم بەڕوودادەخەن
هەموو ژوورە تاریکەکانی نەزانین
نەیانتوانی
تەنها یەک پیت لە پیتەکانی مرۆڤ بوونم
بخوێننەوە

دەرگای دۆزەخم بەڕوودا خەن
هەموو بورکان و کوورەکانی ئەوێندەرێ
نەیانتوانی
پارچە خەڵووزێکی نێو مەقەرەی عەشق
گەشکەنەوە

دەرگای گەڕانەوەم بەڕوو داخەن
هەموو ڕۆژەکان و ساڵەکانی تەمەنی ئەوێم
نەیانتوانی
کۆرپەیەکی گریاوی نێو ئامێزی نیشتیمانم
ژیرکەنەوە

دەرگای ئەمڕۆم بەڕوو داخەن
هەموو کاتژمێرەکان و فەلسەفەکان
نەیانتوانی
ترپەی دڵ و نیگا خەمناکەکانی ڕوانینم
شیکەنەوە

دەرگاکانی سەدەکان و سبەینێشم بەڕوو داخەن
هەموو دروشم و هۆتافە درۆینەکان
هەموو ڕاسان و سروودە گەرم گەرمەکان
نەیانتوانی
پەنجەرەیەکی تەلخ و دوکەڵ لەسەر نیشتووی
نێو ژوورەکانی
نائومێدی و بێهوودەیی و گومانەکانم
لێبکەنەوە

دەرگای کۆشکەکانی
پاشا و گەدا و کوێخاکانم بەڕوو داخەن
هەموو سەردارەکانی دونیا
نەیانتوانی

لە نێو بەزم و سەمای نێو کۆشک
میلۆدییە ناسکەکانی
ڕاستی وەک خۆی
جوانی وەک خۆی
ژیان وەک خۆی / بلێنەوە

دەرگای گۆڕستانم بەڕوودادەخەن
هەموو ئەهریمەن و بوونەوەرەکانی ناو گۆڕ
نەیانتوانی
مرۆڤە ونبووەکەی نێو خەیاڵ و ناخم
بدۆزنەوە

دەرگای تیاترۆخانەکانم بەڕوودادەخەن
هەموو خانەکانی تریش
نەیانتوانی
چووزەرەیەکی ئارەزووە فەریکەییەکانی
نێو ڕۆحی شەقارشەقار بووم
دامرکێننەوە

دەرگای ئاسمانم بەڕوودادەخەن
هەموو ئەستێرە و خۆرەتاوەکان
نەیانتوانی
کۆڵارەیەکی منداڵیم
لە دارتەلێکی نێو کۆڵانەکان / بکەنەوە

دەرگای بیابانم بەڕوو داخەن
هەموو بیابانەکان
نەیانتوانی
ئەفسانە و داستان و چیرۆکەکانی
عەشقی ئێمە
بۆ کچە چاوڕەشێکی بیابان / بگێڕنەوە

دەرگای مێژووم بەڕوو داخەن
هەموو کتێبەکانی مێژوو
نەیانتوانی
لەدواهەمین پێشانگای
نەخشەی نیشتیمانانی دونیا
نەخشەی نیشتیمانی منیش / هەڵواسنەوە

دەرگای ڕەشەبام بەڕووداخەن
هەموو ڕەشەباکان
نەیانتوانی
لەنێو کتێبێکی پیرۆز هەڵم بگرن
بۆ زێدی ژنە عاشقەکانم / بەرنەوە

٣

هەموو دەرگاکانی گەردوونم بەڕوودادەخەن
من لەنێو خەون و هاواری شیعر
دێمە نێو ژیانەوە ... !

# ماسکەکەت فڕێدە ئەی شۆخ

ماسکەکەت فڕێدە ئەی شۆخ
با ڕووناکی چاوەکانت
تێکەڵ بە شەوەکانی عومرم بێ
با خۆرەتاوی خەمەکانت
بڕژێتە نێو خۆرئاوابوونەکانی خەیاڵم
با جوانیەکانی ڕوخسارت
تێکەڵ بە سروشتی هەناسەم بێت
با شەونمی سەر پەڕەی لێوەکانت
نیشتیمانی نێو خەونەکانم تەڕ بکات

ماسکەکەت فڕێدە ئەی شۆخ
من دەمەوێ حەقیقەتی ڕوخسارت ببینم
ڕووت ڕووت وەکو با
ڕووت ڕووت وەکو بەفر
ڕووت ڕووت وەکو ئاو
هەر بەم باڵا ڕووتە ڕێواسییەوە
لەنێو منداڵدانی عەشقەوە
وەرە نێو ماڵە ڕەنگینەکەی شیعر
هەر بەم ئەدگارە ڕووتە ئاتەشییەوە
لە نێو منداڵدانی شیعرەوە
وەرە نێو ماڵە ڕەنگینەکەی ژیان
ماسکەکەت فڕێدە ئەی شۆخ
وەک کچە کۆچەرییەکانی نێو نیشتیمانی خەون
سادە و ساکار

لە نێو گەرمیانی ئارەزوومەوە
وەرە نێو کوێستانی ڕۆحم
لە نێو پەرستگەکانی دڵی من
ڕووت ڕووت بەرەوە
ڕووت ڕووت وەکو عەشق
ڕووت ڕووت وەکو شیعر
ڕووت ڕووت وەکو ژیان

چیت لێ بشارمەوە ئەی شۆخ ..؟!
من ماڵم لە هیچ شوێنێک نەبوو
هیچ شوێنێک ماڵی منی لێ نەبوو
نیشتیمانی من لە هیچ کیشوەرێک نەبوو
هیچ کیشوەرێک نیشتیمانی منی لێ نەبوو

ئێستا /
من نیشتیمانم بە کۆڵ خۆم داداوە
لە نێو کیشوەرەکانی باران
لە ژێر ڕەشماڵێکی ڕەش ڕەش
ڕەش ڕەش وەکو بەفر
لەنێو خەیاڵێکی سپی سپی
سپی سپی وەکو سێبەر
لە چاوەڕوانیت دام
لێرە / سروشت و خوا و
هەموو زیندەوەرەکان
لە چاوەڕوانیت دان
تۆش ماسکەکەت فڕێدە و وەرە
کە هاتی
ئەو دەفتەرەی
یادەوەریەکانی خۆمم تیا نووسیبوو

لەگەڵ خۆت دا بۆم بهێنە
بیرت نەچێت
تۆش هەموو شتێکم بۆ بنووسە
ئەو ڕۆژەی کە گوتت
من لە پەنجەرەکانی مردنەوە دەڕوانم
یان کە گوتت
من لەنێو مردنەوە خەون دەبینم
یان کە گوتت
ژیان تەنها ئەو وەرزانەی خۆش بوو
کە عاشق بووم
تکایە ئەی شۆخ
هەموو شتێکم بۆ بنووسە / هەموو شتێک
باسی ئەو
شەوە سوور سوورە سەوداسەریەشم بۆ بکە
کە مەست مەست

باسی مردن و ماسکت بۆ دەکردم
مەست مەست وەکو مۆم
لە نێو میلۆدییەکانی مردن دەتوایەوە
مەست مەست
باسی وەرزە وەنەوشەییەکانی کچێنی خۆتت
بۆم دەکرد
مەست مەست باسی ئەو ئێوارە ئەرخەوانییەی
کە لە ژیان یاخی بوویت
خۆتدایە دەست گەردەلوولی مەملەکەتی مردن
ئەی شۆخ
من لەنێو نیشتیمانی باران
لە ژێر ڕەشماڵێکی ڕەش
ڕەش
وەک بەیانیە کازێوەییەکانی عەشق
لەنێو خەیاڵێکی شین

شین شین
وەک ئێوارە لێو بە خەندەکانی شیعر
لە چاوەڕوانیت دام
تۆش / تەنها ماسکەکەت فڕێدە و وەرە
ئەی شۆخ
بیرت نەچێت / بەر لەوەی بێیت
باسی هەڵوەرینی ئەو گەڵایانەم بۆ بکە
کە لە وەرزە بێ مەیلەکان دەتۆرێن
باسی ئەو شەقامانەم بۆ بکە
کە چیتر دڵیان بە پیاسەی عاشقەکان ناکرێتەوە
باسی ئەو ڕووبارانەم بۆ بکە
کە لە شەوە خامۆشەکاندا گۆرانی بۆ هەور ناڵێن
باسی بێهوودەیی عەشقم بۆ بکە لە نێو مردنی ژیاندا
باسی ڕەشبوونی سێوەکانم بۆ بکە
لە نێو عەبەسیەتی سەوزایی درەختەکاندا

باسی تەڵخبوونی ئاوێنەکانم بۆ بکە
لە سەردەمی خۆکوشتنی کات دا
باسی بە خۆڵەمێشبوونی کتێبە پیرۆزەکانم بۆ بکە
لە نێو خەیاڵی سەربازێکی تێکشکاوی سەردەمی جەنگەکاندا
ئەی شۆخ بیرت نەچێت
باسی ڕووتبوونەوەی بەهارم بۆ بکە
لە نێو خەیاڵی پایزدا
باسی ڕووتبوونەوەی پەپوولەم بۆ بکە
لە نێو خەیاڵی گوڵە سپیەکان دا
باسی ڕووتبوونەوەی خۆرەتاوم بۆ بکە
لەنێو خەیاڵی کازێوەدا
باسی ڕووتبوونەوەی ئەستێرەکانم بۆ بکە
لە نێو خەیاڵی ئاسمان دا
باسی ڕووتبوونەوەی تریفەم بۆ بکە

لە نێو خەیاڵی تاڤگەکاندا
باسی ڕووتبوونەوەی خاکم بۆ بکە
لە نێو خەیاڵی نیشتیماندا
ئەی شۆخ
کە هاتی /
من لە نێو دڵۆپە بارانێک
ڕووت ڕووت
لەژێر ڕەشماڵێکی پەمەییدا
ڕووت ڕووت
لە نێو خەیاڵێکی نازنجی دا
لە چاوەڕوانیت دام
کە هاتی / بیرت نە چێت
هەموو شتێکم بۆ باس بکە / هەموو شتێک
تۆش / دە بەڕێکەوە دەی
تەنها / ماسکەکەت فڕێدە و وەرە

ئەی شۆخ
لە نێو کیشوەری باراندا
پێویستیت بە ماسک نییە
لێرە پێویستیت بە پەنجەرە نییە بۆ ڕوانین
لێرە هەموو شتەکان ڕووتن وەکو ئاو
لێرە هەموو شتەکان دەبریسکێنەوە
وەک تراویلکە هەنارییەکانی ئێواران
لێرە نیشتیمانمان وەک بەرماڵێک
لەژێر ڕەشماڵێک ڕاخستووە
نوێژە عەشقی لەسەر دەکەین
لێرە هەموو زیندەوەرەکان عاشقن
لێرە ژیان بە مانای عەشق
عەشقیش بە مانای ژیان .
ئەی شۆخ من لێرانە
لەژێر ڕەشماڵێکی سوور سوور

لە سەر بەرماڵەکەی نیشتیمان
لە چاوەڕوانیت دام
لێرە سروشت و خوا و
هەموو زیندەوەرەکان / لە چاوەڕوانیت دان
تۆش تەنها ماسکەکەت فڕێدە و وەرە ...!

**سەرەتای ئەیلولی ٢٠١٠**

# تەنیایی من و ژنێکی ڕەشپۆش

لە نێو ڕووبەری عەشقی تۆ
ژیان و بوون
مانایەکیان نییە
هەر مردن و هەر مردن و
مردن و مردن و مردن
تا چاویش بڕکات
هەر هیچ و هەر هیچ و
هەموو شتەکان
بێبەها و هیچن
لە نێو ڕووبەری جوانییەکانی تۆ
مردن مانایەکی نییە
تا چاو بڕکات

هەر بوون و هەر بوون و
هەموو شتەکان
بەها و بوونیان هەیە
بەم هاوکێشە
میزاژیانە و عەبەسیانەت
منت کۆنفیوز کردووە
ئەی ژنە جوانە ڕەشپۆشەکە
هۆ ژنەکە
لە هەرکوێ بیت
لە نێو / دووڕگەکانی دۆزەخ
یان لەنێو / باخچەکانی بەهەشت
یان لە نێو / هەوارگەکانی هەور
چاو لە ماڵە خنجیلانەکەی ژیان بگێڕە
بە هێمنی لە دەرگا بدە و بڕۆ ژوورەوە
چیتر لە نێو

تاریکی شەو و
ژوورە تەنیاییەکەی خۆت
مەمێنەرەوە
یان نیگارە تەنیاییەکەی خۆت
بە ڕەنگە ئاچوغەکانی تەنیایی من
ڕەنگ مەکە
چیتر / گوڵە تاقانەکەی
نێو مەرکانە تەنیاییەکەی خۆت
بە لاوک و لاوژەکان و
بە شمشاڵە شەهوەتاوییەکەی
تەنیایی من / مەلاوێنەوە .
من لە شەوێکی هاوین
لە شەوێکی خەمناک و خامۆش
شەوێکی گزنگی خوناوکەیی
تەنیایی خۆم

لە تەنیشت یادەوەریەکانی تۆ
لە نێو چوارپایەی تریفەی مانگ
جێهێشتووە
ئێستا تەنیایی من
لە جیاتی مردن
پڕاوپڕە لە کولیکە سوورەکانی ژیان
ئێستا تەنیایی من
لە جیاتی مردن
گۆرانی بۆ ژیان دەڵێ
هۆ ژنە جوانە ڕەشپۆشەکە
دەپێم بڵێ
کێ دەتوانێ وەکو من
بە نێو
تاریکایی جەستە تەنیاییەکەی تۆدا
ڕەت ببێ

کێ دەتوانێ
لە نێو ئۆقیانووسە ئیرۆسییەکانی
نێو جەستە پڕ شەپۆلاوییەکانی تۆ
مەلە بکات
وەکو من
مۆری و مەرجانەکانی جوانیت بدۆزێتەوە
ئیتر لە هەر کوێ بیت
تارا ڕەشە
قەترانییە ترێییە تەنیاییەکەت / فڕێدە
لە نێو قۆزاخەی نیگەرانیش وەرە دەرێ
پشت لە مردن بکە
بە دوای ماڵە خنجیلانەکەی ژیاندا بگەڕێ
بە هێمنی لە دەرگا بدە و بڕۆ ژوورەوە
من لە وێدا
لە شەوێکی بەهار

شەوێکی بێداری بارێزەیی
تەنیایی خۆم
لە تەنیشت
پەیکەری هەناسە گەرمەکانی تۆ
لە نێو باخچە خەملیوەکانی نێو دڵی خاک
جێهێشتووە
ئێستا تەنیایی من
لە جیاتی مردن
پڕاوپڕە لە گوڵە
نێرگزە چاوگەشەکانی نیشتیمان
ئێستا تەنیایی من
لە جیاتی مردن
سەما بۆ نیشتیمان دەکات .
ئەی ژنە جوانە ڕەشپۆشەکە
دەتۆش لە شەوێکی زستان

شەوێکی زێڕینی زایەڵەیی
زەڕنەقووتەی / ئارەزووەکانی خۆت ئازادکە
یان لە شەوێکی پایز
شەوێکی پرشنگی پەروانەیی
ڕەشماڵی تەنیایی خۆت
لە بناری تەنیایی من هەڵبدەوە
با بارانی تەنیایی من
وەکو جاران
تەنیاییت تەڕ بکاتەوە
تەڕ تەڕ تەڕ
یان پێکەوە
بەدوای ماڵە خنجیلانەکەی ژیاندا بگەڕیین
بە هێمنی لە دەرگا بدەین و بڕۆینە ژوورەوە
تێر تێر کولیکە سوورەکانی سەفا بۆن بکەین
یان گوڵە نێرگزە چاوگەشەکانی نیشتیمان

هەر پێکەوەش
لەنێو چوارپایەی خەونەکانمان ڕابکشێین
هەر لەوێدا بمێنینەوە
تا تەنیاییمان
پڕ دەبێت لە
گوڵاڵە سپییەکانی عەشق و
سەماش بۆ ژیان دەکەن ..
هۆ ژنە جوانە ڕەشپۆشەکە
بیکە بە خاتری
ماڵە ڕەنگینەکەی عەشق و
مەمکۆڵە خرپنەکانی خۆزگەکانمان
وێنەکانی خۆت لە نێو
ئەلبوومەکانی تەنیایی
بێنە دەرەوە
یان چیتر

بیره‌وه‌ریه‌كانی خۆت
له‌ نێو ده‌فته‌ره‌كانی مردن
مه‌نووسه‌ره‌وه‌
هۆ ژنه‌ جوانه‌ ڕه‌شپۆشه‌كه‌
بیكه‌ به‌ خاتری من و
خاتری خودا
با پێكه‌وه‌ سه‌ما بكه‌ین
سه‌ما بكه‌ین سه‌ما ...!

**به‌فرانباری ٢٠١١**

# نیشتیمانی مەمک

## ١

گوڵەگیان
گەر بزانم
خودای عەشق و پەروەردگار
نیگار و پەیکەری
مەمکە سیحراوییەکانی تۆی
بە دەست و پەنجەکانی خۆی نەخشاندووە
دڵنیابە
بە بێ هیچ شک و گومانێک
دەچمەوە ماڵی خودا و
لە گەڵیدا ئاشت دەبمەوە

## ٢

من کە هێندە ئارەزووی
گوشینی مەمکم هەیە
دە لەسەر سینگە وشکهەڵاتووەکانی
خەونەکانم
جووتێک
مەمکی مەریەمیم پێ ببەخشە
ئەی خودا ..!

## ٣

من سێوە لەتلەتییەکەی بەهەشت و
هەموو سێوەکانی دنیات بۆ دەگەڕێنمەوە
تۆش تەنها
مەمکەکانی یەکێک لە پەرییەکانی فیردەوسم

پێببەخشە
ئەی خودا ..!

## ٤

ئەی خودا
بەزەییت بێت
دوور لە
مەیل و مەمکەکانی یار مەمکوژە
من هێشتا
بوخچەیەکی نەکراوەی نێوماڵی عەشقم
هەزار و یەک قەسیدەی نەنووسراو
وا لە نێو مەنزڵگەی خەیاڵمدا
هەزار و یەک مێخەکی بۆنخۆش
وا لەنێو مێرغوزاری نیشتیمانمدا
هەزار و یەک مۆمی گەش

وا لە نێو مۆمدانی مەراقەکانمدا

٥

ئەی خودا
بەزەییت بێت
بە نێو تاریکی ئەم غوربەتیەم
زێتر مەمبەرە خوارەوە
با بۆ تەنها جارێک
دڵبەرەکەم
لە نێو
شەوە شەبەنگییەکانی
نێو نیشتیمانی مەمک
کتێبێکی عەشق بخوێنێتەوە.
ئینجا لەوە تێدەگا
غەریبی ڕێیەکی لە مردنە

یان بۆ تەنها جارێک
خۆی بداتە دەم
تاڤگەی هاوارەکانم
ئینجا لەوە تێدەگا
مردن ڕێیەکی لە غوربەتە
یان بۆ تەنها جارێک
بە ئاگری سەر سینگی شەوەکانم
خۆی گەرم بکاتەوە
ئینجا لەوە تێدەگا
غەریبی و مردن
ڕێیەکیان لە مەملەکەتی
نێو شیعرەکانی منە ..!

٦

ئەی خودا
من بەرگەی ئەم غەرییبیەم ناگرم
دەگەڕێمەوە
بەزەییت بێت
وەکو جاران
دەرگای دڵ و خەونەکانی دڵبەرەکەم
لێبکەرەوە

## ٧

گوڵەگیان
کە هاتمەوە
لە بەهەشتێکی
پڕ لە میوەجات و
پڕ لە مێلاقە سوورەکانی مەمک

من دەمەوێ تا ئەبەد
موریدێکی خودایی بم
کە هاتمەوە
لە نیشتیمانێکی
پڕ لە مەمک و
پڕ لە میلۆدییە مژدەبەرەکانی مرادم
من دەمەوێ تا ئەبەد
پەیامبەرێکی عاشق بم ..!

سەرەتای فێبرووەری ٢٠١١

# کۆدەکانی عەشق

## ١

دوێنێ شەو
خەونێکم بینی
سادە وەک خەونەکانی مندالّیم
خەونێکی ڕەش نا
خەونێکی سپی سپی
خەونێکی سپی نا
خەونێکی پەمەیی
خەونێکی پەمەیی نا
خەونێکی شین

خەونێکی شین نا
خەونێکی سوور
گرینگ ئەوەیە خەونێکی زۆر خۆش بوو
بەیانیش کە لە خەو هەڵسام
چاوەکانم پڕ ببوون لە نیگا
نیگاکانم پڕ ببوون لە خەیاڵ
خەیاڵەکانم پڕ ببوون لە شیعر
شیعرەکانم پڕ ببوون لە عەشق !

## ٢

تۆ یەکەم کەس بووی
لە ژوورە شێدارەکەی دڵی خۆت
زیندانیت کردم
ساڵانێکی زۆر
ون و بێسەر و شوێن بووم

لەسەر سیاسەت نا
لەسەر عەشق
لەسەر شەڕ و ئاژاوە نا
لەسەر عەشق
لەسەر خۆپێشاندانەکانی سەر شەقام نا
لەسەر عەشق
عەشق عەشق عەشق
عەشق تا ئەبەد عەشق !

٣

ئەمشەو دەمەوێت
خۆم هێندە مەست بکەم
تا ناوی خۆم و هەموو شتێکم بیر دەچێتەوە
دەمەوێت هەر بەو مەستییەوە
لە جەستەی ڕووتی ژیان بڕوانم

بەسەرهات و
چیرۆکی عاشقبوونی خۆشم بنووسمەوە !

٤

تۆ بووی منت گەیاندە ئێرە
ئێرەی ئەوپەڕی ڕووبەرەکانی
تەنیایی و شێتبوون
تۆ بووی منت ئاشنا کرد
بە کیشوەرە بێناونیشانەکان و
بە بیابانەکانی مردن
تۆ بووی
لە سەر پشتی شەپۆلەکانی
بێهوودەیی و
لە نێو قوولاییترین
دووڕیانەکانی ڕەشەبا بەجێتهێشتم

تۆ بووی
یەکەمین کاتژمێرت کردە دەستم
تا ساڵەکانی غوربەتم بۆ بخوێنێتەوە
هەر تۆش بووی
بەر لەوەی ببم بە ئەشقیایەکی دۆڕاو
لەژێر ڕۆشنایی
مۆمی مەمکۆڵەکانی خۆت
دیوانێک پڕ لە شیعری عاشقانەت
پێ پڕکردمەوە !

**_ ئاوێنەیەک لە نێوان مردن و تەنیایی :**

**١ / ئاوێنەی تەنیایی**

لەنێو ئاوێنەی تەنیاییم
من بە زمانی درەخت

قسە بۆ خوداوەند دەکەم
بە زمانی بەفر
قسە بۆ خاک دەکەم
بە زمانی باڵندە
قسە بۆ خۆرەتاو دەکەم
بە زمانی باران
قسە بۆ خەمەکانم دەکەم ٠
بە زمانی شیعر
قسە بۆ خۆشەویستی دەکەم
بە زمانی مەرگیش
قسە بۆ خۆم دەکەم ... !

**٢ / ئاوێنەی مردن**

لە نێو ئاوێنەی مردنم
دەبم بە پەیکەرێک لە سێبەر

بەدوای خەونەکانی شەودا دەگەڕێم
لە سەر هەر کانیەکی تریفەی مانگ
دەستنوێژێک هەڵدەگرم
لە سەر پەڕەی هەر چلەنێرگزێک
ئایەتێکی ئیرۆسی دەنووسمەوە
لە کۆتاییش دەبم بە تابلۆیەک
پڕ لە کۆدەکانی عەشق
لەنێو پەرستگەکانی با
یان لەنێو تیشکە شینەکانی ئاو
ڕووت ڕووت دەبمەوە
خۆم بە ناسکی
خەیاڵە خەملیوەکانی تۆ و
بە خەمە خاکییەکانی خاک دەسپێرم .!

**کۆتایی ئاياری ٢٠١١**

# ئەوان دەڕۆن و ئێمە دەمێنینەوە

با شەقامەکان بکەین بە ماڵمان
تا ڕێژنە بارانی ئاسوودەیی و
ڕێژنە بارانی موحیبەت
تەڕمان نەکات نەڕۆینەوە
بەیەکەوەش
گۆرانییە پڕ سۆزەکانی عەشق و
سروودە پڕ ڕازەکانی خۆرەتاو و
لاوکە پڕ ڕەنگەکانی باخچە و
بەستە پڕ نەغمەکانی
بەهارێکی نوێ بڵێینەوە ...!

با شەقامەکان بکەین بە ماڵمان
تا پەیکەری خەون و ئارەزووەکانمان
دێنە قسە و زەردەخەنەکانیان
بە سنەوبەر و ڕەشەڕەیحانەی
ئومێدەکانمان دەبەخشن
تا دەبین بە تابلۆیەک
ڕەنگینتر و ناسکتر لە ئێستامان
ئێمە ، لەم کەرنەڤاڵی
ڕاسان و لەدایکبوونەوەیەدا
هیچ لە دەست نادەین
جگە لە مەرگی شێنەیی هەمیشەمان

با شەقامەکان بکەین بە ماڵمان
تا جێهێشتنی دوا مەنزڵگەی مردنمان

تا هەڵوەرینی دوا گەڵای خوداکان
لەم کەرناڤاڵی عەشق و
لەم کەژاوەی لە دایک بوونەوەمان
نارۆینەوە
تا ماڵەکانمان پڕ نەبێ لە خۆشەویستی و
شەقامەکانمان پڕ نەبێ لە ڕووناکی
ئێمە لەم ڕووبەری ڕاسان و ( ڕێژوان ) ەدا
هیچ لەدەست نادەین
جگە لە خەونە کابووسیەکانی شەوانەمان

با شەقامەکان بکەین بە ماڵمان
تا گەیشتن بە دنیایەک
( کە جوانتر بێت لە هەمیشە )
تا گەیشتن بە نیشتیمانێک
کە ڕەنگینتر بێت لە هەمیشە

تا گەیشتن بە ئایندەیەک
کە سپیتر بێت لە هەمیشە
ئێمە لەم کەرنەڤاڵی ڕاسان و ژیانەوە
تا کرێوەی دوا ڕێگاکانی ڕەهابوون
تەڕمان نەکات ، نارۆینەوە
تا چرینی دوا هەڵبەستی هەستانەوە
مەستمان نەکات ، نارۆینەوە
چونکە دواجار
( ئەوان دەڕۆن و ئێمە دەمینێینەوە ) ..!

**٢٥ ی شباتی ٢٠١١**

# نوختەکانی سەر شینی شەو

## ١

بە نێو خەونەکانم ڕەت دەبم
تا کەوتنی
نوختە ڕەش ڕەشەکانی
سەر شینی شەو
بە نێو ساتە لاشعوریەکانم ڕەت دەبم
تا ڕوونتربوونی
نوختە ئاویەکانی
سەر شینی شەونم
بە نێو عەشقدا ڕەت دەبم
تا فڕینی
نوختە نەرم نەرمەکانی

سەر شینی شیعر ..!

## ٢

من دەمەوێت
لەگەڵ بادا
بە نێو کۆڵانەکانی ڵم دا ڕەت ببم
من
دەمەوێ بزانم
برژانگە ڕەشەکانی ڕەشەبا
کەی سپی دەبنەوە
یان دەمەوێ بزانم
دوو چاوە خومارییە ترێیەکانی بروسکە
ڕەشترن
یان نوختە ڕەشەکانی
سەر شینی شەو .. ؟

فرمێسکەکانی ئاو تەڕترن
یان نوختە ئاویەکانی
سەر شینی شەونم
نوختە بێدەنگەکانی
سەر شینی ناوەوەی نیشتیمان مەستترن
یان نوختە نارنجیەکانی
سەر شینی شیعر ..؟
دەزانم ڕۆژێک
لەنێو ڕووبەری خەمەکانمدا
دەمرم و
وەڵامی پرسیارە ئەزەلیەکانیشم دەست ناکەوێت !
دەزانم ڕۆژێک
لە نێو عەبەسییەتی خەونەکانم دا دەمرم
دارسنەوبەر و عاشقەکان
بۆم دەچەمێنەوە و

جەلادەکانیش سەما دا دەبەستن ..!

## ٣

سێبەری درەختێک
لە نێو گەردەلوولی خەونەکانم
لوول دەخوات
تا دەمگەیەنێتە کەنار
ئۆقیانووسەکانی بێهوودەیی
دەنکە هەنارێکی
تەنیشت تاتەشۆری سەر کانی خۆزگەکانم
دەبریسکێتەوە
تا دەمگەیەنێتە کەنار
ختووبەکانی ونبوون

## ٤

لە نێوان من و عەشق و تەنیایی
لە نێوان من و باخچە و شێتبوون

لەنێوان من و نیشتیمان و سەراب
لە نێو سێبەری تەنیاییم ڕاکشام
تا بووم بە ڕەبەنیترین موسافیر
نائومێدیم
بە ڕەنگە پایزییەکانی غوربەت سپارد
تا مردن و ونبوون لە نێو خۆمدا

٥

کتێبێک پڕ لە پیتە سەوزەکانی زەیتوون
ملوانکەیەک پڕ لە زەنگیانە ڕەنگاوڕەنگەکانی ئاگر
سیدییەک پڕ لە نەغمە سەرخۆشەکانی بەهار
مەرکانێک پڕ لە گوڵە پەمەییەکانی بەفر
تاقگەیەک پڕ لە هاژە فۆبیایەکانی وەهم
سەبەتەیەک پڕ لە گەڵا زەردەکانی مانگ
قەڵەمێک پڕ لە خوێنە شەڕابیەکانی مێژوو

هەر هەموویان بە تەڵخی
لە نێو ئاوێنەی
خەم و خولیا و خەونەکانم دەبینرێن ...!

## ٦

لە کەنار دەریاکانی غوربەت
من و مردن
بە دوو هێلی تەریب پیاسە دەکەین
بەڵام لە نێو کێڵگەکانی عەشق
هێلەکانی من و مردن
دەمێکە یەکترییان بڕیوە ..!

## ٧

من هەمووجارێک
بەرلەوەی
بە نێو خەونەکانم ڕەت ببم

گیرفانەکانی خەیاڵم
پڕ دەکەم لە وشەی سپی
کتێبی برینەکانم
پڕ دەکەم لە وشەی ڕەش
هەمووجارێکیش
چیرۆکەکانی منداڵی خۆم
بە وشە خۆڵەمێشیەکانی شەونم
یان بە وشە شینەکانی شیعر
لەسەر پەڕپەڕی
گوڵاڵە سوورەکانی خۆرەتاو
د ە ن وو س مە و ە..!

کۆتایی ئاداری ٢٠١١

# جێگۆڕکێی پیتەکان و شکۆمەندی مرۆڤ !

{ شەڕ ، شەو ،ماڵ ، عەشق ، شەقام }

**- شەڕ**

ئەگەر شینی شەڕ بگۆڕین بە کاف
وشەی شەڕ دەبێتە کەڕ
ئێمە لەوەتەی هەین لەنێو ماڵی خەونەکانمان کەڕمان دەکەن
پێمان دەڵێن گوێ هەڵمەخەن
بێدەنگ بن و بێدەنگ بن و بێدەنگ بن
ئەگەر شینەکە بگۆڕین بە تەڕ
وشەکە دەبێتە تەڕ

ئەگەر ئەیەکەی نێوانیان لابەرین
وشەکە دەبێتە تڕ
یان ئەگەر ئۆیەکی بخەینە سەر
وشەکە دەبێتە تڕۆ
بەمانای
مرۆڤە تڕۆ و تڕکەنەکانی شەڕ
تەڕنابن و تەڕ نابن و تەڕ نابن
بۆیە شینی شەڕ پرسیارێک دەکات و دەڵێ
شکۆمەندیت لە کوێیە ئەی مرۆڤ ؟

- شەو

ئەگەر شینی شەو بگۆڕین بە خێ
وشەکە دەبێتە خەو
ئێمە لەوەتەی هەین لەنێو ماڵی خەونەکانمان
خەو دەمانباتەوە و هەر دەخەوین

خۆ ئەگەر شینەکە بگۆڕین بە ڕێ
وشەکە دەبێتە ڕەو
ئێمە لەوەتەی هەین لەنێوماڵی نیشتیمانمان
هەر ڕاو دەندرێین و ڕەو دەکەین
هەر ڕەو و هەر ڕەو و هەر ڕەو
شینی شەویش هەمان پرسیار دەکاتەوە و دەڵێ
شکۆمەندیت لە کوێیە ئەی مرۆڤ ؟

**- ماڵ**

ئەگەر میمەکەی ماڵ بگۆڕین بە سین
وشەکە دەبێتە ساڵ
ئێمە چەندین ساڵە و لەوەتەی هەین
لەنێو نیشتیمانی خەونەکانمان
ماڵێکمان نییە بۆ عەشق
ماڵێکمان نییە بۆ ئارامی

ماڵێکمان نییە بۆ ژیان
ئیدی میمەکەی ماڵیش دەپرسێت و دەڵێ
شکۆمەندیت لە کوێیە ئەی مرۆڤ ؟

**- عەشق**

ئەگەر عەینی عەشق بگۆڕین بە میم
وشەکە دەبێتە مەشق
بە مانای
ئێمە لەوەتەی هەین لە نێو ماڵی خەونەکانمان
مەشقمان پێدەکەن بۆ مردن
مەشقمان پێدەکەن
بۆ ونبوون و فەنابوون و
خۆکوشتن
ئیدی
عەینی عەشقیش

هەمان پرسیاری شینی شەڕ دەکاتەوەو دەڵێ
شکۆمەندیت لە کوێیە ئەی مرۆڤ ؟

- شەقام

ئەگەر شینی شەقام بگۆڕین بە میم
وشەکە دەبێتە مەقام
ئێمە شەقامی خەونەکانمان
پڕ کردووە لە
مەقام و گۆرانی و سروود
لە کەرنەڤاڵ و کەژاوە و کرێوە
بۆئەوەی
شەقامەکانمان وەکو باخچەکانی ئەوین
پڕبن لە گوڵ و ڕووناکی
وەک سنەوبەرێکی باڵا بەرزیش

بە مەقامەکانی عەشق بشنێنەوە
بەدەم پیاسەی عاشقەکانیش
ڕوخساریان پڕ بێت لە زەردەخەنە
بەڵام کوانێ ؟
شەقامەکانی ئێمە
بەبێ گوڵ و بێ ڕووناکی و بێ هەناسەن
شەقامەکانی ئێمە
لەنێو بێشکەی پەراسووەکانمان ڕاکشاون
لایلایە بۆ مەرگ و مردن دەکەن
ئیدی
شینی شەقامیش هەمان پرسیار دووبارە دەکاتەوە و دەڵێ
شکۆمەندیت لە کوێیە ئەی مرۆڤ ؟

- **ئاوێزانبوونی وشەکان بەبێ شەقام**

( شەڕ ، شەو ، ماڵ ، عەشق )
ماڵێک پڕاوپڕ بێت لە شەڕ
کێڵگەکانی عەشق
جگە لە چرۆکانی شەوێکی ئەنگوستەچاو
چیتری لێ شین نابێت

عەشق لەنێو ماڵەکانی شەڕ
تووڕەهاتترین خولیایە
لەنێو دەفتەرە خۆڵەمێشیەکانی خەون
ماڵی نێو شەوەکانی پڕ لە شەڕ
دۆزەخێکی ئەبەدی و
گۆڕستانێکی تاریکە بۆ عەشق

ئیدی
شەڕ و شەو و عەشق
لەنێوماڵەکانی ئێمە
هەموویان بەیەکەوە
هەمان پرسیار دووبارە دەکەنەوە و دەڵێن
شکۆمەندیت لە کوێیە ئەی مرۆڤ ...؟

**سەرەتای ئۆگشتی ٢٠١١**

# نیشتیمان و کتێبی خەون

## ١

ئەی بەیاتریسی نێو بارێزەی
بنارەکانی بینناییم
من کە نیشتیمانم خۆشدەوێ
منەت بەسەر دایکم و
منەت بەسەر خاک و
منەت بەسەر تۆوە ناکەم
ئاخر گوڵم
کە نیشتیمانێک نەبێت
لە کوێ ماڵێک بدۆزینەوە بۆ پێکەوە ژیان
کە ماڵێک نەبێت
لە کوێ ژوورێک دروست بکەین بۆ نووستن

کە ژووری نووستنێکیش نەبێت
لە کوێ سیسەمێک دابنێین
بۆ ئاوێزانبوون و خەون بینین
بیرکەرەوە
ئەی تاقەگوڵی نێو باخە گوڵگوڵینەکەی دڵی من
کە نیشتیمانێک نەبێت
لە کوێ ڕووبارێک بدۆزینەوە بۆ ڕوانین
ژێر درەختێک بۆ ژووان و
شەقامێک بۆ پیاسە و
باخچەیەکیش بۆ عەشق
ئیتر ، گلەیی چیم لێدەکەی ئەی گوڵەباخ
کە نیشتیمانێک نەبێت
لە کوێ تابلۆی
خەونە جوانەمەرگبووەکانی من و
تابلۆی

جوانییەکانی مەرگی خەونەکانی تۆ
هەڵبواسین
لە کوێ تابلۆی
تەنیاییە ئافاتییە غوربەتییەکانی من و
تابلۆی
ئافاتە غوربەتییەکانی تەنیایی تۆ
هەڵبواسین
یان کتێبی
یادەورییە چاو بەفرمێسکەکانی منداڵی من و
کتێبی
منداڵییە چاو بەفرمێسکەکانی یادەوەریەکانی تۆ
لە کام دەلاقەی ئارامی هەڵبگرین
لەسەر تاتەشۆری کام کانی
ئایەتێک بخوێنین و
نوێژێک بۆ ئەم عەشقە ئەبەدییەمان دا ببەستین

بۆنی خۆڵی پاش بارانی
کام پێدەشت و کام گوند و لادێی
نێو مەمکۆڵە نامورادەکانی
کام لە ئومێدەکانمان هەڵبمژین
شۆڕەسوارانێ و گیانبازییەکانی نێو داستانەکانمان
لە نێو دەفتەری کام مێژوو بنووسینەوە
ئایندەمان بە قەدەری
کام گەردەلوولی نێو کێڵگە گوڵەگەنمییەکان بسپێرین

٢

دەریا جەستەی دایکمە
نیشتیمانیش
کتێبێکە پڕ لە خەونەکانی وەهم
بەفر پرچی دایکمە
نیشتیمانیش

درەختێکە پڕ لە نیگاکانی وەهم
ئاسمان خەیاڵە شینەکانی دایکمە
نیشتیمانیش
باڵندەیەکی ونە لەنێو تەمتومانی وەهم
من و نیشتیمان و من و دایکم
دەبینە کتێبی ئاسوودەیی
لەنێو وەهمە سپییەکانی خاک

## ٣

دەخیلتم ئەی دەریا
ئەو ئاوێنەیەی سەر ڕوخسارت بگۆڕە
کە پەیکەر و باڵای نیشتیمانم بە تەڵخی پێشان دەدا
ئەو ئاوێنەیە بگۆڕە ئەی دەریا
کە ناتوانم
زەردەخەنەی سەر ڕوخساری خاک ببینم

کە ناتوانم سەمای ڕووناکی ببینم
لەبەردەم ڕووتبوونەوەی گیادا
ماندووم ئەی دەریا
چیتر توانای گەمەی
ئاوێنەکان و
سەرابەکان و
خەونەکانم نەماوە
ئەو ئاوێنەیە بگۆڕە ئەی دەریا
من دەمەوێ ڕوخساری مۆنالیزای نیشتیمانم
بە ڕوونی ببینم
فرمێسکەکانی سەرگۆنای بسڕمەوە
لە ئامێزیدا ڕابکشێم
من نامەوێت چیتر
لەنێو بێهوودەیی جوانییەکانی تۆ
خەو بمباتەوە

ئەی دەریا من ماندووم و
توانای گەمەی
خەونە سەرابییەکانی غوربەتم نەماوە نا

## ٤

من و نیشتیمان
تابلۆیەکین پڕ لە ڕەنگەکانی وەهم
بە دیواری بێهوودەییش هەڵواسراوین
مێژووی من و مێژووی نیشتیمان
لەنێو کتێبێکە
فڕێدراوەتە نێو بیابانەکانی ئاگر
من و نیشتیمان
چیرۆکێکی وەهمین
لە شەوە بەر ئاگردانییەکانی پاییز
جارجار بەفر

لەسەر پەراسووەکانی خۆی دەماننووسێتەوە
دەریاکانی خەونیش هەروەکجاران شەپۆل دەدەن
لەنێو ڕووبەرەکانی مردن

## ٥

ئەی قەدەر
من دەمەوێ نیشتیمانم
لەنێو تەمتومان و تەپوتۆزی وەهم دەربهێنم
من دەمەوێت
بەرگی ژیان بکەمە بەر نیشتیمانم
من دەمەوێت
نیشتیمانم کاراکتەرێکی کارا بێت
لەنێو بوون و
خەون و خەیاڵ و عەشقی من

من دەمەوێت
نیشتیمانم وەکو دایکم
تا ئەبەد زیندوو بێت
بە نیگایەکی پڕ لە میهر
وەرزێک لە وەرزەکانی منداڵیم
خەونێک لە خەونەکانی لاوێتیم
بۆ بگەڕێنێتەوە
ئاخ
خۆشم دەوێیت
ئەی نیشتیمانە غەریبەکەم ..!

**سەرەتای دیسەمبەری ٢٠١١**

# کاتژمێری تەمەن و ئەفسانەی تەنیاییم

١

کاتژمێری تەنیایی من
لەنێو بێهوودەییم ئاوس بووە
تک تک
بێشکەی نیگەرانیەکانم ڕادەژەنێ و
تەمەنم ناخوێنێتەوە

٢

من هەموو دوای نیوەڕۆیەک
تەنیایی خۆم لە باخچە جێدەهێڵم
جارجارەش لە پەنجەرەوە سەیری دەکەم
بە تایبەت ئەو دەمانەی
لەگەڵ پەپوولە مێیەکان سەما دەکات

٣

من حەز دەکەم
تەنیاییم بە جۆرێک ڕابێنم .
نەوەک خۆم شەرمن بێت
نەوەک جەلادێکیش
لە هیچ شتێک نەسلەمێتەوە

٤

من باکم بەوە نییە کەناچمە بەهەشت
بەڵام زۆر حەزدەکەم
تەنیاییم لە بەهەشتدا
تا ئەبەد بمێنێتەوە

٥

من شەوانان
لەگەڵ تەنیاییم ناخەوم
نەوەک
خەونە ئیرۆسییەکانم لێم بتۆرێن

٦

من کە دەڕۆمە دەرەوە
تەنیاییم لەگەڵ خۆمدا نابەم

نەوەک
فریشتە پرشنگییەکانی خۆرەتاو
شەرم لە نیگاکانم بکەن

٧

من هەمیشە
دەفتەری یادەوەری تەنیایی خۆم
لە ژنەکەم دەشارمەوە
نەوەک
گومان لە کۆدەکانی نێو شیعرەکانم بکات

٨

من کە دەگەڕێمەوە نیشتیمان
تەنیایی خۆم
لە غوربەتدا

لە کەنار دەریایەک جێدەهێڵم
نەوەک
کچۆڵە ڕۆح شەبەنگییەکانی لای خۆمان
لەنێو گۆشە تاریکەکانی تەنیایی
پرچی سپی بهۆننەوە

٩

من کە بیر لە تەنیایی دایکم دەکەمەوە
ڕقم لە تەنیایی خۆم و
لە هەموو شتێکی تەنیا دەبێتەوە

١٠

من هەندێکجار
جلەکانی تەنیایی مانگ لەبەردەکەم
تا تەنیایی خۆم نەمناسێتەوە

یا دەبم بە میوانی تەنیایی خودا
تا تەنیایی خۆم نەمدۆزێتەوە

## ١١

گەر جارێکیتر
بروسکەی عەشق لە نێو خەونەکانی من
پەیدا بێتەوە
بەر لە هەرشتێک
ئاگر لە تەنیایی خۆم و
لە تەنیایی
هەموو مرۆڤەکانی تر بەردەدەم

## ١٢

چەند وەرزێکە
لە سەر ڕووی گەڵایە هەڵوەریوە تەنیاکان

وێنەی تەنیایی خۆم دەکێشم
تا زیاتر لە تەنیایی مێیینەی درەخت
نزیک ببمەوە

## ١٣

هەرکاتێک باس لە خۆکوشتنم دەکەم
ئەوە کەسێکی تەنیایە لە نێو مندا
نەک خۆم

## ١٤

ئەگەر تەنیاییم
لە شێوەی شەشپالوێک خۆی بنوێنێ
ئەوا مردن تەنها دیوێکیەتی

## ١٥

هەر شەوێک
تریفەی مانگی تەنیایی تۆ دەربکەوێ
تەنیاییم لە هەر جێگایەک بێت
بەبێ شەرم خۆی ڕووت دەکاتەوە
خۆی لە جوانی تەنیایی تۆ دەئاڵێنێ

١٦

شووشەی دڵی تەنیایی من
کە هەتا ئێستاکە نەشکاوە
ئەوە لە چاوەڕوانی
مەریەمێکی تەنیای
لە خۆم تەنیاترە

١٧

لەو ڕۆژەوەی
تۆ کاتژمێری تەنیایی منت کردۆتە دەست
لەو ڕۆژەوە من نازانم
لە نێو کام وەرزی دۆزەخم

## ١٨

حەیف ...
تۆ ئەو مرۆڤە تەنیایە نەبوویت
کە نهێنی تەنیاییەکەی خۆتت
لە نێو لەپی تەنیایی من دەنووسییەوە
تۆ ئەو شەهرەزادە عاشقە نەبوویت
کە تەمەنی هەزار و یەک شەوەی تەنیایی خۆت
بە نووری تەنیایی من ڕووناک بکەیتەوە

## ١٩

من دەمەوێت
لە نێو تەنیایی تۆدا بمێنمەوە
بەڵام ، لەنێو تۆ نا
من ئێستاکەش
ئیرەیی بە جوانی تەنیایی تۆ دەبەم
بەڵام ، جوانی تۆ نا

## ٢٠

هۆ کچە تەنیاکە
من هەمیشە حەزدەکەم
تەنها تۆ تەنیا بیت
هیچ کەسی تر نا
من هەمیشە حەزدەکەم
تەنیایی خۆم لە خاچ بدەم
بەڵام ، تەنیایی تۆ نا

## ٢١

لەورۆژەوەی
تۆ منت خستە نێو دڵی خۆتەوە
ئەوە تەنیاییت بوو
نەک حەزی خۆت
لەو ڕۆژەوەی
منیش تۆم لەنێو دڵی خۆم تووڕ هەڵداوە
ئەوە حەزی خۆم بوو
نەک تەنیاییم

## ٢٢

من گەورەترین هەڵەم کرد
کە ڕێگەمدا
بارانی تەنیایی خۆم

بەسەر کێلگە تینووەکەی
تەنیایی تۆ و
بەسەر ملوانکەکەی
نێو مەمکۆڵەکانت ببارێت
کە ڕێگەمدا
تەنیاییم
کڕنووش بۆ تەنیایی تۆ ببات
عاقیبەت
تەنیایی تۆ بوو بە جەلاد و
تەنیایی منیش
بوو بە کۆیلەیەکی ئەبەدی ..!

## ٢٣

هۆ کچە تەنیاکە
دەتوانیت بگەڕێیتەوە
من خۆم نا
تەنیاییم بیری تەنیایی تۆ دەکات
دەتوانیت بگەڕێیتەوە
من و تۆ نا
با تەنیاییمان
لەگەڵ یەکدا جووت ببنەوە
وەکو تاڤگە
بڕژێنە نێو جەستەی خاکەوە
وەکو ماسیە کۆچەرییەکان
لەنێو دڵی ئاو
ڕەشماڵێک بۆ خۆیان هەڵبدەن

وەک پەیامبەرێکی عاشقیش
کتێبە پیرۆزەکانی عەشق بنووسنەوە
ئەوکات
با کاتژمێری تەنیاییمان
هەر مردنمان بخوێنێتەوە ...!

**سەرەتای بەفرانباری ٢٠١٢**

# کۆشکە ڕازاوەکەی نێو خەونە سپییەکانی من

**بۆ : بەناز جەوادی جوانەمەرگ**

لە نێو خەونە سپیەکانی من
کۆشکێکی ڕازاوە هەیە
بەرین بەئەندازەی
هەموو کیشوەرەکانی دنیا
ڕازاوە بەئەندازەی
هەموو باخچە ئەفسووناوییەکانی خەیاڵ
ڕووناک و بریسکەدار

وەک مەنزڵگە چراخانییەکانی بەهەشت
پڕاوپڕ لە باغ و بێستانی ڕەنگین
لە وەنەوشە و گوڵاڵە سوورەکانی عەشق
من ئەو کۆشکە ڕازاوەیەی
نێو خەونە سپیەکانی خۆم
نافرۆشم
نەک بە ( دە ملیۆن و دووسەد هەزار ! )
بە هەموو موڵک و سامانی دنیا
نایگۆڕمەوە
بە هەموو زێڕ و گەوهەر و
یاقووت و ئەڵماسە بە نرخەکانی خودا
لەم کۆشکە ڕازاوەیەی
نێو خەونە سپیەکانی من

( بەنازەکان ) خۆیان ناسووتێنن
( سەردەشتەکان ) ناکوژرێن
منداڵەکان ،
لەسەر شۆستەکان دەستفرۆشی ناکەن
لاوان پەت ناخەنە گەردنی خۆیان
دایکان و باوکان
بەدیار سفرەی بەتاڵەوە فرمێسک نارێژن
کۆرپەکان بە چیرۆکی
نێو دەفتەری جەلادەکان ناخەوێندرێن
باڵندەکان لەنێو قەفەز بەند ناکرێن
سنەوبەرەکان بە قەیرەیی پیر نابن
پەپوولەکان سەرگەردان و بێپەروا نامرن
ماڵەکان زیندانێک نین بۆ عەشق
ئەستێرەکان تاشەبەردێکی تاریک نین لە ئاسمان
تابووت لە پەراسووەکانمان دروست ناکەن

کتێبی خەوننامەکانمان پەڕ پەڕ خوێنی لێناچۆڕێ
مانگ لەوێدا ڕەنگ زەرد و تەنیا نییە
پاییز ناسنامەی خەزان و نائومێدی نییە
ڕەوەندەکان بە ڕەهایی گەرمیان و کوێستان دەکەن
باران بە ڕەهایی دەبارێ و
سروشتیش بە ڕەهایی پێدەکەنێ
لە نێو ئەم کۆشکە ڕازاوەیەی
نێو خەونە سپیەکانی من
ژیان مانای هەیە
عەشق مانای هەیە
مردن مانای هەیە
هەموو شتە جوانەکان مانایان هەیە
مرۆڤ پڕ بەهاترین و پیرۆزترین بوونەوەرە
هەریەکێکمان
هەڵگری ڕۆحی ملیۆنەهای ترین

هەموومان
لەسەر پشتی شەپۆلەکان
ئارام ئارام
گوڵە ئاوییەکانی ئارەزووەکانمان بۆندەکەین
کەسمان بە تەنیا لەنێو تەنیاییدا نامرین
بێهوودەیی ماڵی ئەبەدی کەسمان نییە
بە بۆنی سێو کەسمان کوێرنابین
میلی کاتژمێرەکان
لەنێو خۆڵەمێشی کازێوەو
تەپوتۆزی سروودە وەهمیەکان ژەنگ هەڵناهێنن
هەموومان
ڕووت ڕووت وەکو شەونم
جووتە جووتە
بە نێو شەقام و باغەکان پیاسە دەکەین
لە جێژووانەکانیش تا شەکەت و هەناسەبڕکێ

لە ژێر نەرمەبارانی موحیبەت سەما دەکەین
شەوانانیش بەدەم گوێگرتن
لە سەمفۆنیای تاڤگە و ڕووبارەکان
لە ئامێزی تریفەی مانگدا دەخەوین
ئەم کۆشکە ڕازاوەیەی
نێو خەونە سپییەکانی من
تەنانەت منیش خاوەنی نیم
نەمن ، نە تۆ ، هیچ کەسێکمان
بە هەر ڕێگایەکی نێو ئەم کۆشکە ڕازەوەیەدا بڕۆی
دەگەیتەوە بەردەم ژوورێک
لەسەر دەرگاکەی نووسراوە
بە زەردەخەنە گەرمەکەت
ئەم مۆمە داگیرسێنە ئینجا بڕۆ ژوورەوە

ئەم کۆشکە ڕازاوەیە
ماڵی عەشق و ژیانمانە
نیشتیمانێکە بۆ هەمووومان ..!

**ناوەڕاستی سیپتەمبەری ٢٠١١**

# کاتژمێری بێدەنگی

دەتوانیت هیچ قسەیەکم بۆ نەکەیت
تەنها وشەیەکیش
من لە زمانی بێدەنگیت تێدەگەم
من وەک ئەو درەختانەم
کە لە بێدەنگیدا
عەشق لەگەڵ باراناندا دەکەن
من وەک ئەو ماسیانەم
کە بە بێدەنگی دەچنە ژووان و
خۆیان لە ژانەکانی بێهوودەیی
بەتاڵدەکەنەوە
من وەک ئەو نیگارکێشانەم
کە تابلۆکانیان

پڕاوپڕە لە کۆدەکانی بێدەنگی
من لە جنسی ئەو گەڵایانەم
کە بە بێدەنگی هەڵدەوەرن
من لە پاشماوەی ئەو کلۆبەفرانەم
کە بە بێدەنگی
خۆیان رووت دەکەنەوە بۆ با
تا ئەو زمانی بێدەنگیەت فێربووم
چەندین جار لە خاچیان دام
بەسەر هەموو هەورازەکاندا هەڵگەڕام
غروری خۆمم لە نێو مەمکەکانی
ژنێکی مەکرباز جێهێشت
بووم بە میلی کاتژمێری هەموو زەمەنەکان
زەردەخەنەی سەر ڕوخساری
فریشتە فاسقەکانم شیکردەوە
حیکایەتە خەمناکەکانی

نێو فرمێسکی باڵندەکانم نووسییەوە
هەموو کتێبە ئاسمانییەکانم خوێندەوە
بە نێو خەونی هەموو مەخلوقاتێکدا ڕەتبووم
من هەموو بەیانیانێک
پەیکەری بێدەنگی تۆ
لە سەر باڵی پەپوولەیەک دەنەخشێنم
دەینێرم
بۆ باخچە ڕەنگینەکەی نێو دڵی مانگ
دەینێرم بۆ
یەکەبە یەکەی
ژووری نووستنی ئەستێران
بۆ پەرستگەی ژنە ڕاهیبەکانی بەهەشت
بۆ باغی پەرییەکانی دۆزەخ
بۆ تیاترۆخانەی
ئیبلیسە مێیینەکانی عەشق

بۆ گۆڕستانەکەی نزیک ماڵی خودا
بۆ هەموو بنیادەمێک
لە هەموو شوێنێک
پەیکەری بێدەنگی تۆ دادەنێم / ئەی گوڵەباغ
هیچ قسەیەکم بۆ مەکە
منیش ئێستا
بوومەتە دیوێکی تری بێدەنگی
ئێستا لەلای من
بەرد جوانترین توحفەیە
وا خەریکە منیش
باوەڕ بەوە بهێنم و بڵێم
ژیان بە بێدەنگییەوە جوانە
شەقام بە بێدەنگیەیوە ڕەنگینە
عەشق بە بێدەنگییەوە شیرینە
تکایە هیچ قسەیەکم بۆ مەکە

من بێزار بووم
لە موجامەلە و لاوژە درۆینەکانی عاشقان
لە هات و هاوارەکانی ڕەشەبا و
نرکە و نالّەکانی ئاگر و
لە لوورە لوورەکانی گەردەلوول
من لە نێو بیابانی بێدەنگی تۆ
گۆڕێکی بە کۆمەڵی عاشقانم دۆزیەوە
ئێسک و پرووسکی پیاوەتی خۆشم لەنێویاندا بینی
لەسەر یەکێک لە پەراسووەکانم نووسرابوو
( بم بەخشە ئەی گوڵەباغ
کە نەمتوانی بۆ تەنها جارێکیش
تەوقی بێدەنگیت بشکێنم و
ئارەزووە ئیرۆسییەکانت بهێنمە قسە ..! )
دەتوانی هیچ قسەیەکم بۆ نەکەیت
کە عەشق بوو بە هاوکێشەیەکی بێبەها

ئیدی
مۆرفیمی وشەکانت
چ ڕەنگێک بە بەهاری مردنم دەبەخشن
وشە شەرمناویەکانی نێو نامەکانت
چ چارۆگەیەک
بۆ بەلەمی نغرۆبوونم هەڵدەکەن
تازە هیچ شتێک نەماوە بۆ گوتن
لێگەڕێ ،
با کاتژمێری بێدەنگیت
تا ئەبەد
خەونە پەرتبووەکانی
نێو نائومێدیم بخوێنێتەوە ..!

**سەرەتای مارسی ۲۰۱۲**

# خەونە سۆزانییەکانی من و چەند پیتێکی بریندار

وەرە ئەی یار
با پەیمانێکی تر ببەستین
کە جودا بێت لە پەیمانەکانی ترمان

وەرە ئەی یار
من هەموو جەستەی خۆمت پێدەبەخشم
تەنانەت
گلێنەی چاوەکانیشم
من هەرچیم هەیە پێتدەبەخشم
تەنانەت
سۆزانیترین خەونەکانیشم

وەرە ئەی یار
هەر چیم هەیە بۆ خۆت بەرە
شیعر و
کتێبە چاو بە فرمێسکەکانیشم
چاویلکەکەم
قەڵەمەکەم
مۆمەکانی نێو ژوورەکەم
گوڵدانی گوڵەکانم
بوخچەی خەیاڵە نەوڕەسییەکانیشم
تەنانەت دەفتەری یادەوەریەکانیشم
منیش تەنها
چەند پیتێکم لەتۆ دەوێ
چەند پیتێکی
لانەواز و چاو بەخومار و بریندار
ئەو پیتانەی

نەک بە تەنیا
بەیەکەوەش
نە ناوێک و نە ڕەنگێک و وێنەیەکیان
لە هیچ ئەلبوومێک و
لە هیچ کیشوەرێک و
لە هیچ دنیایەکدا نییە ..!

- پیتەکان ( ن ن ا ت ش ی م ی )

ئەی یار
نونێکم لە نەوڕەسەکان بۆ وەربگرە
نونێکی تر لە نوور
ئایەک لە باران و
تێیەک لە ترێیە چاوڕەشەکان و
شینێک لە شەوە پڕ تریفەکان
یایەک لە یاقووت و

میمێک لە مرواریەکانی دەریا و
یاییێکی تر لە خۆت ئەی یار
منیش بەم پیتانە
( نیشتیمان ) ێک دەنەخشێنم
کە پڕاوپڕ بێت
لە نەوڕەسی باڵڕەنگین و
لە نووری سپیدە
لە بارانی بەهاری و
لە ترێی چاوڕەشی قەترانی
لە شەوی پڕ تریفە و
لە یاقووتی بریسکەیی
لە مرواری دەریا و
لە یاری باڵازڕاڤ و هەوەسباز و مەمک قنج
نیشتیمانێک
پڕ بێت لە سوارچاکی

نێو پێدەشتە نەخشینەکانی عەشق
پڕ بێت لە شنەبای ئێواران و
لە نەغمەی گوڵەگەنم و
لە باڵندەی سەرمەست و
لە کولیکە سوورەکانی موحیبەت

نیشتیمانێک
وەرزەکانی بە ڕەنگی ترەوە دەرکەون
سەمفۆنیایەکی تر
لە ماڵەکان و لە جێژووانەکان ببیسترێ
پەپوولەکان
بە ستایلێکی تر سەما بکەن
ژیانیش
بە جۆرێکی تر خۆی ڕووت بکاتەوە

نیشتیمانێک
دۆزەخێکی ئارام و
پەرستگەیەکی ڕووناک و
بەهەشتێک بێت بۆ هەموومان
بەهەشتێکی
بێ سەردار و بێ سوڵتان و بێ خودا ..!

**کۆتایی مایسی ٢٠١٢**

# تۆ لە نێو خەونەکانی من

من لەنێو خەونەکانم وا ڕاهاتووم
لەژێر کەپرە فێنکەکانی گیا
سەرخەوێک بشکێنم
بەسەر شەقامە تەڕەکانی شەونم
پیاسە بکەم
لەگەڵ پەپوولەکانیش بڕۆمە نێو
باخچە ڕەنگینەکانی هەوڕ
زەردەخەنە بە ژیان ببەخشم
عەشقیش بە حیکایەت و ئەفسانەکان
هێمنیش بە بەفر و جوانیش بە ئەستێرەکان

من خەون بەتۆوە دەبینم
کەچی تۆ لە نێو خەونەکانی من نیت
من هەموو ژیانم بەتۆ بەخشیوە
کەچی تۆ لە نێو ژیانی من نیت
من هەموو شیعرەکانم بۆ تۆ نووسیوە
کەچی تۆ لە نێو شیعرەکانی من نیت
کە هەموو دەرگایەکم بە ڕوو دادەخرێ
واز لە ژیان و شیعر و خەونەکانی خۆم دەهێنم
دێمە نێو خەونەکانی تۆ
بەڵام گوڵەگیان
کە من دێم تۆ لەوێ نیت
تۆ لە نێو خەونەکانی من
باران دەبارێنیت بەسەر زەویە وشکەکانی ڕۆحم
پەنجەرەکانی ڕوانینم دادەپۆشی بە شەونم
لێوە تامەزرۆییەکەی عەشقم

بە مەرهەمی ئارەزووەکانی خۆت فێنک دەکەیتەوە و
خۆشت لەوێ نیت
تۆ لە نێو خەونەکانی من
هەندێکجار
بەهار دەهێنیتە نێو ڕۆژئاوای خەیاڵم
یان / شەوانان مردن دەهێنیتە نێو ژوورەکەم
یان لەنێو ئەلبوومی تەمەنم
ئاگر لە وێنەکانی تەنیاییم بەردەدەیت و
خۆشت لەوێ نیت
لە بیرمایە یەکەمینجار
کە بەڕووتی هاتییە نێو خەونەکانی من
لەژێر دارسێوێکی ڕووت
پەیامی ڕووتبوونەوەت بۆ خوێندمەوە
منت لە نێو شیعرەکانم ڕووتکردەوە

بە شاعیرە ڕووتەکە بانگت دەکردم
کەچی ئێستا تۆ لەوێ نیت
هەرگیز ئەوەشم بیرناچێتەوە
لە دوای نیوەڕۆیەکی نارنجیدا لە نێو خەونەکانم
لە نێو پارکێکی خەیاڵی و لەژێر سێبەرێکی ئەفسووناویدا
گوتت / چاوەکانت بنوقێنە و دەستەکانتم بدەرێ
لەسەر نینۆکی پەنجەی بچووکم نووسیت میم
لەسەر نینۆکێکی ترم نون
لەسەر نینۆکێکی تر تێ
لەسەر نینۆکێکی تر ئۆ
لەسەر نینۆکێکی تر میم
لەسەر نینۆکێکی تر خێ
لەسەر نینۆکێکی تر ئۆ
لەسەر نینۆکێکی تر شین
لەسەر نینۆکێکی تر دێ

لەسەر نینۆکێکی تر ئێ
لەسەر ناو لەپێ دەستی ڕاستەم واو
لەسەر ناولەپێ دەستی چەپەم ئێ
دواتر گوتت / چاوەکانت بکەرەوە و بیخوێنەوە
خویندمەوە نووسیبووت / من تۆم خۆش دەوێ
من تۆم خۆشدەوێ
کەچی ئێستا تۆ لە نێو خەونەکانمدا نیت
تۆ لە نێو خەونەکانی من
کە دەتبینم خۆمت لێ دەشارمەوە
کە لێم ونددەبیت بە دواتدا دەگەڕێم
کە دەمدۆزیتەوە لێتراڕدەکەم
کە دەریش ناکەویت / دەڵێم
گوڵەگیان
خۆزگە تۆ لێرە دەبوویت
تۆ لە نێو خەونەکانی من

دەتبەم بۆ شوێنێک
ڕازاوەو ڕەنگین  وەک دڵی خۆم
شوێنێکی بەرز / وەک قووڵایی دەریاکان
یان /
شوێنێکی قووڵ / وەکو لوتکەی شاخەکان
لەوێدا لەبەرامبەر پەیکەرە ئاویەکەت
کڕنووش دەبەم و دەڵێم
خۆزگە تا ئەبەد لێرە دەبوویت .
گوڵەگیانم
خۆزگە تا ئەبەد لەنێو خەونەکانمدا دەبوویت !

**ئۆسلۆ / نەرویج**
**سەرەتای دیسەمبەری ٢٠١٢**

# (من و تۆ)

من هەمیشە
لەسەر دیوارەکانی خەیاڵم
شیعرە شینەکان و
لەسەر جەستە ڕووتەکەی تۆش
خۆم دەنووسمەوە

کۆترە ئیرۆسییەکانی نێو خەونەکانم
بۆ هەر کوێ بفڕن
دواتر دێنەوە و
لە بنار مەمکۆلەکانی تۆ دەنیشنەوە

وەرزەکانی تەمەنی من
وەکو شەپۆل
بە نێو ڕووباری نیگەرانیەکانی خۆم و
بەنێو جۆگەلە مەست و پڕ هاژەکەی
نێو مەمکۆڵەکانی تۆ تێدەپەڕن

من قژی خاوی تۆ دەکەم بە ڕەشماڵێک
بۆ کوڕانی گەڕەکەکەمان نا
تەنها بۆ خۆم
دەمارەکانی عاتیفەشت بە جۆلانەیەک
بۆ کچانی دراوسێکانم نا
ئەویش بۆ خۆم

تۆ لە بووکە شووشەیەکی چاو سەوز دەچیت
دەمەوێت

هەموو شەوێک
لەئامێزی خۆمدا بتخەوێنم

جەستەی تۆ پایزێکی لێو تەڕە
سێوەکانی نێو خەیاڵیشت
کانی شیعرم دەتەقێنێتەوە

من نە لە شیلەی نیگاکانت
نە لە خەونە پەرتبووەکانت
نە لە زەردەخەنە ئیرۆسییەکانت
تێرنابم و تێرنابم و تێرنابم

باڵای تۆ کەمانجەیەکی گیاییە
شەونمە ئیرۆسییەکانی ڕۆح
بە سەما دەهێنێ

چاوەکانت
پڕن لە تریفە پرشنگییەکانی شەو
مەمکەکانیشت
پڕن لە میلۆدییەکانی مەستبوون

جەستەی تۆ
لە شەتلە ڕەیحانەیەکی تەڕ دەچێ
لە باخچە نارنجییەکانی مانگ
دەم بۆ خۆرەتاوی عەشق دەکاتەوە

دەڕۆم دوور دەکەومەوە
دوور لە تۆ نا
دەمەوێت بگەڕێمەوە
نێو تەمە سپییەکانی خەون

من هێندە سەرمەستم بە تۆ
لە نێو ماڵە سپییەکەی هەور
جگە لە ڕوخسارە ڤینۆسییەکەت
هیچ ئەدگارێکی تر نابینم

من و تۆ
لە دوو باڵندەی مۆرفیمینی شیعر دەچین
بە نێو ئاسمانە شینەکەی خەیاڵ
دەسوورێینەوە

من و تۆ
لە دوو درەختی ئاوی دەچین
وا پێدەچێت
چیتر پێویستمان بە بارانی خودا نەبێت

من و تۆ
تابلۆیەکین
پڕ لە ڕەنگە ئاچوغەکانی عەشق
ڕەنگەکانی خۆمان
بە جوانی و
بە خەون و
بە ژیان دەبەخشین ..!

**هەولێر / کەنەدا .. شباتی ٢٠١٣**

# دیسان (من و تۆ)

گوڵە گیان
میمێک لە میهری خۆت
دەیدەم بە تۆ
تۆش لە نێو مەمکۆڵەکانت
بۆم هەڵبگرە
نوونێک لە نەرم و نیانی خۆت
دەیدەم بە تۆ
تۆش لە نێو دڵتدا
بۆم هەڵبگرە
واوێک لە وێنە جوانەکەی خۆت
دەیدەم بە تۆ

تۆش لە نێو ئیمەیلێکت
بۆم هەڵبگرە
تێیەک لە ترێیەکەی چاوی خۆت
دەیدەم بە تۆ
تۆش لە نێو جانتاکەت
بۆم هەڵبگرە
ئۆیەک لە برۆیە ڕەشەکەی خۆت
دەیدەم بە تۆ
تۆش لەنێو بوخچەی نهێنیەکانت
بۆم هەڵبگرە
گوڵەگیان
هەرکاتێک لەمن دوور بیت
میمی نێو مەمکۆڵەکەت
نوونی نێو دڵەکەت

واوی نێو ئیمەیلەکەت
تێی نێو جانتاکەت
ئۆی نێو بوخچەکەت
لە تەنیشت یەک ڕیزیان بکە
دەبن بە ئاوێنەیەکی سیحری
لە نێویدا
من لە تەک خۆتا دەبینیەوە
دیسانەوە ( من و تۆ )
من من من
تۆ تۆ تۆ
گوڵەکەم / تا ئەبەد هەر من و تۆ

جونی ٢٠١٣

# شیرین و جوانە زمانی عەشق

کچێک لە نێو کتێبە پیرۆزەکانی عەشق
خۆی بە من ناساند
منیش لەنێو هاوارە ئیرۆسییەکانی شیعر

ئەو بە ڕەنگە زەردەکانی پاییز و
منیش بە ڕەنگە شەڕابییەکانی شیعر
لە بەیانییەکی غەمزەیی خەونێکی سپیدا
تابلۆی ئاوێزانبوونەکانمان ڕەنگ دەکەین

ئەو بە پارچە سوورەکانی مانگ و
منیش بە ئەستێرە پرشنگییەکانی شیعر
لە شەوە تاریکەکانی عەشق
بەدوای یەکتریدا دەگەڕێین

ئەو لەگەڵ پەپوولە سپییەکانی بەهار و
منیش لەگەڵ وردە ماسییە دڵگەشەکانی شیعر
گۆرانی عەشق بۆ یەکتری دەڵێین

ئەو بە دڵۆپە شەونمەکانی ئارەزووی
منیش بە وشە ئیرۆسییە دڵتەڕەکانی شیعر
لێوە وشکەکانی یەکتری تەڕ دەکەینەوە

ئەو بەتارایەکی وەنەوشەیی تەنک و
منیش بە گەڵای گوڵە شلێریەکانی شیعر

لە مانگە شەوێکی هاویندا
یەکتری دادەپۆشین
ئەو بە زمانی شیرینی عەشق
منیش بە زمانی شەونمی شیعر
هەموو شەوێک یەکتری دەلاوێنینەوە

ئەو بە زەردەخەنە زێڕینییەکەی سەر ڕوخساری
منیش بە نەرمە بارانە دوای نیوەڕۆیەکانی شیعر
حەسرەتەکانی غوربەتمان دەرەوێنینەوە

ئەو بە ماچ و لێو مژینە نەرمەکانی
منیش بە خونچە خەیاڵێکی تازەی شیعر
هەموو بەیانیان یەکتری بێدار دەکەینەوە

**سەرەتای جونی ٢٠١٣**

# سەفەرێک بەنێو جەستە

من حەزم لە بۆنکردنی قژی خاوتە
سووتاوم
بۆ بینینی تۆقە سوورەکەشت

من شێتی چاوە سەوزەکانتم
گیرۆدەم
بۆ برژانگە شینە داوداوەکەشت

من تامەزرۆی مژینی لێوەکانتم
تینووم
بۆ هەڵدانی لیکی نێو خۆزگەکانیشت

من کوشتەی هەردوو مەمکەکانتم
هەڵوەدادام
بۆ ملوانکەکەی سەر گەردەنیشت

من حەیرانی بەژن و باڵاکەتم
دێوانەم
بۆ ڕۆینی پڕ لەنجەولارەکەشت

## ٢

من دەمەوێ
لەنێو چاوەکانت بمێنمەوە
بڕۆمە نێو ڕووبەری نیگاکانیشت

من دەمەوێت
دڵی گەورەت  بکەم بە نیشتیمانی خۆم
قەدپاڵەکانی بنار مەمکەکانیشت

من دەمەوێت
لە نێو خەونە ئیرۆسییەکانت
گوڵدانێکی پڕ لە گوڵی نارنجی بم
هەورێکی بەهاریش بم
لە ئاسمانی خەیاڵە سپییە گەرمەکانیشت

من حەزدەکەم
بازنەیەک بم لە دەستی تۆ
یان پەپوولەیەک بم
لەسەر ستیانە تەنکەکەشت

## ٣

ئارەزوو دەکەم
وەکو ئاوریشم نەرم بم
نەرم بدوێم لەگەل تۆ

خۆزگە دەخوازم
وەک تریفە بدرەوشێمەوە
بدرەوشێمەوە لە نێو چاوەکانی تۆ

بە ئومێدم
وەکو گژوگیا تەڕ بم
تەڕ بکەمەوە ناخ و لێوە وشکەکانی تۆ

**ئایاری ٢٠١٣**

# پێنج پرسیار

## ١

گەر بپرسن
جیاوازی نێوان
مردن و ژیان چییە ؟
لەوانەیە بڵێین
هەناسەیە
ئێ خۆ بە ملیارەها مرۆڤ
وا هەناسە دەدەن
کەچی تخوبەکانی نێوان
مردن و ژیان دیار نین
چ مردنێکی هێواشە ئەم ژیانە !

## ٢

مرۆڤ
یان شێتە
یان عاشقە
یان شاعیر
من هەرسێکیانم
ئەی تۆ ؟

## ٣

من / لە نێو شیعر شینم
لە نێو خەون نارنجیم
لە نێو عەشق سەوزم
لە نێو بەهار زەردم
لە نێو پاییز سوورم
ئەی کێ دەزانێت
بە چ ڕەنگێک لە دایک بووم ؟

## ٤

چاو بۆ خەیاڵ
پەنجە بۆ ژووان
دڵ بۆ عەشق
مەمک بۆ ژیان
ئەی کێ دەزانێت
زمان بۆ چییە ؟

## ٥

گەر هەموو
درەختەکان وشک بن و
ببن بە تۆز و غوبار
خۆیان بدەنە دەم با
ئەستێرەکان دەکوژێنەوە
باڵندەکان یاخی دەبن

باران چیتر
مەمکۆڵەکانی خاك و
قژی گژوگیا تەڕ ناکا
ئەی
گەر مرۆڤەکان
ببن بە بەرد
چی ڕوودەدا ؟

تەموزی ٢٠١٣

## (نـ)

گوڵەکەم
بیری تۆ و
بیری ئەو ڕۆژانە دەکەم
کە دڵۆپە شەونمەکان
لەسەر پەنجەرەی ئومێدەکانەوە
بەگوڕ دەهاتنە خوار
بیری ئەو ڕۆژانە دەکەم
کە بۆ یەکەمینجار لەوە گەیشتم
عەشق مانای چییە
بۆ یەکەمینجار
ڕەنگ و گەڵاو تریفەی عەشقم بینی

بە دەم پیاسە و
بەدەم کرێوەی باران و
لە نێو خەونە بلێسەییەکانم
لە هەموو وەرزێک
بە هێمنی
گوێم لە سەمفۆنیای عەشق ڕادەگرت
بیری ئەو ڕۆژانە دەکەم
کە وەک مرۆڤە کۆچەریەکان
دڵ تەڕ و خاکی
هەرجارەی
لە شەقام و کۆڵانێک
لە گەڕەک و هەوارێک
لەسەر پشتی شەپۆلێک
بوخچە و بارگەمان دادەنا
لەگەڵ سروودە ئاگراویەکانی بروسکە

باڵمان دەگرت
لەنێو باخچەکانی هەور و گۆڕەپانی ئەستێران
هەناسەمان بە خاک دەبەخشی
بیری ئەو ڕۆژانە دەکەم
کە لە دەشتە کاکی بەکاکیەکەی شیعر
کەپرێکمان هەڵدابوو
بە کەمانجەیەکی خەنەیی
کچ و کوڕە خوێن گەرمەکانمان
بە سەما دەهێنا
بیری ئەو ڕۆژانە دەکەم
کە دەلاقەی ماڵەکانمان پڕ بوو لە کتێب
لە شەوە تاریک و ئەنگوستە چاوەکان
گڤوگیامان
لەسەر پرسیارە حەرامکراوەکان لادەدا

گوڵەکەم
شیرینترین ڕۆژیش
ئەو ڕۆژە بوو کە زمانم هاتە گۆ و
فێر بووم بڵێم نا
نا نا نا نا نا نا نا نا نا
نا / بۆ من وەک ئەوە وابوو
نوونەکەم لە نان و
ئایەکەم لە ئاو وەرگرتبێ
نا بۆ من نان و ئاو بوو
نا بۆ من
عەشق و ژیان بوو
نا / بۆ من
وشەیەکی پڕ بەها بوو
وەک بەها جوانەکانی مرۆڤ
نا / بۆ من هەموو شتێک بوو

دەی گوڵەکەم
بەر لەوەی
لەم غەریبییەدا بمرم
پەیکەری جەستەم دابەشبکە
پەنجەکانم بۆ شیعر
لێوەکانم بۆ شمشال
قاچەکانم بۆ عەشق
سیەکانم بۆ خەون
چاوەکانم بۆ نیشتیمان
ژوورێکی دڵم بۆ تۆ
ژوورەکانی تر بۆ ژیان

نـا نا نا نا نا نا نا نـا نا نا نا نا نا نا نا نا
نـا نا نا نا نا نا نا نـا نا نا نا نا نا نا نا نا
نـا نا نا نا نا نا نا نـا نا نا نا نا نا نا نا نا
نا نا
نا نا نا
نا نا مردن نا نا
نا نا نا
نا نا
نا نا نا نا نا نا نا نا نا نا نا نا نا نا نا نا

تەنانەت تـاڵە قژێکیشم ... بۆ مردن نا

**ناوەڕاستی ئەپریلی ٢٠١٣**

# شێرکۆ بێکەس و تریفەی عەشق

## ١

**-( قەدەری مەرگ )**

ئەفســووس مەرگ ڕێگەی نەدا جارێکی تر بتبینمەوە ، بە نیازبووم ئەمجارەیان کــە بێمە لات زێتر لەلات بمێنمەوە .. بەیەکەوە ، هەندێک باســی ، نیشــتیمان و عەشــق و شــیعر بکەیــن ، باســی هەموو شــتێک بکەین بەس مــردن نا ..! حــەزم دەکرد لەگەڵ تۆدا ، پیاســەیەک بە نێو شــەقامە ڕەنگینەکانی ( کازێوە و دوو سروودی کێــوی و ڕووبــار و دەربەندی پەپوولە و یاداشــتی ماکەوێکی ڕەشــپۆش و ڕۆژمێری شاعێرێک و گۆڕستانی چراکان و ئێستا کچێک نیشتیمانمە و .... ) بــە ئارامــی لــە نێو ئەلبوومــی وێنەکانت ، لە نێو خەیاڵــە جوانەکانت ، لــە نێو شــەوە تەنیا و بێداریەکانت ، گەمە لەگەڵ وشــە ناســکەکانت بکەم و تاوێکــی خۆشــیش بمێنمەوە .. برام شــێرکۆ ، خــۆت دەتزانی مــردن بەرەو ماڵەکــەی تــۆ کەوتۆتە ڕێ ، بۆیە لەســەر بەرگی دواهەمین کتێبت نووســیت ( خێراکــە مردن خەریکە بگات ) .. ئەی شــاعیرەکەی نێو کــەژاوەی یاخیبوون و عەشــق ، ئێســتا لەگەڵ مندا ، نیشــتیمان خەمناکە ، پەپوولەکان خەمناکن ، ژنــەکان خەمناکــن ، عاشــقەکان خەمناکن ، جیــاکان خەمناکــن ، ڕووبارەکان

خەمناکــن، دار بــەڕووەکان خەمناکــن، شــیعر و سرووود خەمناکــن، سـپیدە و کازێـوە خەمناکــن، زمــان و وشــە خەمناکــن، قەڵەمــەکان خەمناکــن، تەنانــەت خوداکانیــش خەمناکــن، ئێمــە بــۆ تاهەتایــە قەرزبــاری تۆیــن ، ئــەی مرۆڤــە جوانەکــەی نێــو نیشــتیمانی شــیعر .

## ٢

**- (تریفەی عەشق)**

قەسیدەکانی شێرکۆ بێکەس
هاوارێکی بەردەوام بوونٚ
هاوارێک لەنێو هەورەوە
بانگی ڕووناکی و
بانگی بروسکە و
بانگی ئەستێرەکانی دەکرد
هاوارێک لەنێو بارانەوە
بانگی درەخت و
بانگی خاک و
بانگی شەپۆلەکانی دەکرد

هاوارێک لە نێو خۆرەوە
بانگێ عەشق و
بانگی مرۆڤ و
بانگی ژیانی دەکرد

شێرکۆ نیشتیمانی عەشقە و
عەشقیش ئۆقیانووسی شیعر

خۆر لەنێو
شیعرەکانی شێرکۆ هەڵدێ و
لە کەنار ڕووبارەکانی عەشقیش
ئاوادەبێ

شێرکۆ بورکانی عەشقێک بوو
تێنوێتییەکەی بە گڕ دەشکا

شێرکۆ ژیانی کرد بە شیعر
لە نێو دەقەکانی ژیان
بێهوودەییەکانی خۆی نووسییەوە
نیشتیمانی کرد بە شیعر
لەنێو دەقەکانی نیشتیمان
بێهوودەییەکانی ئێمەی نووسییەوە
مردنی کرد بە شیعر
لەنێو دەقەکانی مردن
بێهوودەییەکانی خاکی نووسییەوە

ئێستا نیشتیمانم
لە پێشوازی کەژاوەی
گەڕانەوەی شێرکۆ
دەست لەسەرسینگ ڕاوەستاوە
ڕووبار بە کەمانجە شینەکەی

سەمفۆنیای سێرنادا دەژەنێ و
پەپوولە و باڵندەکانیش
گشت پێکەوە
سروودی ( خوایە وەتەن ئاواکەی ) و
دارسنەوبەرە دڵسەوزەکانیش
ئەلاوەیسیەکەی مەردان م
دەڵێنەوە
مێژووش فەرشێکی سووری ڕاخستووە

( ئێستا لەوێ
لە نێو تابووتی نارنجی
خۆرنشینی شارەکەما )
جەستەی مرۆڤە ئەرخەوانییەکەی شیعر
بە خەیاڵێکی ڕەنگاوڕەنگ و
بە هەزاران خەونی ئەڤینی

بە دوو چاوی گەشی نەرم و
بە بیست پەنجەی ئاوریشمینی
وا لەوێدا ڕاکشاوە

شێرکۆ
ڕۆژمێری ڕازەکانمانە و
تەمێکی بەفرینە لە وشە
سرووودێکە لە کازیوە و
تریفەیەکە لە هەڵبەست و
توحفەیەکە لە شیعر

بابڕۆین بۆ مەملەکەتی
ئەستێرە سپییەکان
لە ئێوارە کۆڕێکی سەرمەدییانە
لەژێر کەپری تریفەی عەشق

گوێ لە شیعری شێرکۆ بگرین

شێرکۆ بێکەس نەمردووە
ئێستا ئەو
لە نێو دەربەندی پەپوولە
لە نێو ماڵە ڕەنگینەکەی شیعردا
خەوتووە

**١٢ی ئۆگستی ٢٠١٣**

# پێنج هەناسە شیعر

**- ژیان**

من نامەوێت
چیتر سەرخۆش بم
چیتر بێهۆش بم
چیتر خەواڵوو بم
چونکە نامەوێت بۆ چەند چرکەیەکیش
لە ژیان دابڕێم
شیعر
هێندە پەیوەستی کردووم
بە ژیان
تا ئەو ئاستەی

دەمەوێت
ژیان
لە من و شیعر
دووگیان بێت

## ـ ماچباران

ئەوان پەیکەرێکیان سووتاند
بەڵام ئێستا
شەقام و باخچەکان پڕ بوون لە ماچ
چ ڕۆژێکی جوانە ئەمڕۆ
لەگەڵ باران ماچ دەبارێ

**- پەیمان**

وەرە هەرچیەکمان هەیە
با بەشیکەین
دڵم بۆ تۆ

مەمکەکانت بۆ من
چاوەکانم بۆ تۆ
نیگاکانت بۆ من
پەنجەکانم بۆ تۆ
لێوەکانت بۆ من
کاتژمێری دەستم بۆ تۆ
ملوانکەکەت بۆ من
شیعرەکانم بۆ تۆ
خەونەکانت بۆ من

گوڵەگیانم
من حەزدەکەم
بەرداخێک لە لیکی نێو دەمت و
سیگارێکیشت
بە قەرز لێوەربگرم

## - هەراج

لە بازاڕی نیشتیمان دا
لە نێو تابلۆیە سوور و خوێناوییەکان دا
لە سەر شۆستەی وشە بریندارەکان دا
لە شێخەڵڵای خەونە سپییەکان دا
لە بەردەم شاژن و میر و سەرۆکەکان دا
لە نێوان
فرۆشتنی جەستە و فرۆشتنی قەڵەمدا
من بێباکانە
یەکەمینیان هەڵدەبژێرم ...!

**ـ تابلۆیەکی وجودییانە**

من ئەوەم بۆ گرینگ نییە
کە نەزانم بۆ هاتمە نێو ژیانەوە
لە چ ڕۆژێک و لە چ کاتێک لە دایک بووم

یان / بۆ دەستم بە عەشق کرد
کە هەموو وەرزێک و هەموو ساڵێکم
هەر دابڕان و مردن بوو
هیچ تاوانێکیش لەوە دا نابینم
کە وەکو خۆم بیر بکەمەوە و
تەنها خەون بە خۆمەوە ببینم
یان نەتوانم
ملکەچی هیچ خودایەک بم
نامەوێت بیر لەوەش بکەمەوە
کە تۆ / هەر بە بێ هۆ
بە جێتهێشتم
لەگەڵ ئەوەش
دەتوانی بگەڕێیتەوە
بەڵام ئەی شۆخ
ئەوەشت لەبیر بێت

کە جگە لە دەسکە گوڵێکی ڕەش و
زەردەخەنەیەکی سپی
هیچ شتێکی ترم نییە
تا بیبەخشم بە تۆ

# (ڕێگا)

گوڵەگیان
بەو ڕێگایەدا مەگەڕێوە
کە پیایدا هاتووی
بەو ڕێگایەش دا مەڕۆ
کە دەتەوێت پیایدا بڕۆی
هەموو ڕێگاکانت بگۆڕە و
بفڕە بۆ نێو تەمە سپیەکانی خەون
من لەوێدا چاوەڕێتم

بەو ڕێگایەدا مەڕۆ
کە لە سەرێکەوە مەرگی من و
لە سەرەکەی ترەوە

تابلۆیەک دەبینی
من لە نێویدا
بە دەسرۆکەیەکی نارنجییەوە
خەریکی خۆبادان و سەماکردنم

بەو ڕێگایەدا مەڕۆ
کە لە ناوەڕاستی ڕێگاکە
وێنەیەکی تری خۆت دەبینی
لەژێر نەرمە بارانێکی بەهار
چەترێک بە دەستێکت
کتێبێک بە دەستەکەی تر و
سیگارێکیش بە لێوەکانتەوە

گوڵەکەی من
دوورکەرەوە
لەو ڕێگایەی
کە بەنێو مندا ڕەت دەبێ
یان ئەو ڕێگایەی کە بەنێو ئارەزووەکانم
بەڵام ڕێگای نێو خەونەکانم نا

دوورکەرەوە
لەو ڕێگایەی
کە بەنێو نیگاکانم دا ڕەت دەبێ
یان ئەو ڕێگایەی بەنێو خەیاڵەکانم
بەڵام ڕێگای نێو شیعرەکانم نا

بیر لەو ڕێگایەش مەکەرەوە
کە دەتگەیەنێتە

نێو باغ و بێستانەکانی فیردەوس
یان ئەو ڕێگایەی
دەتگەیەنێتە بەردەم
ماڵێکی پڕ لە کتێب
دەربەندێک پڕ لە فەیلەسوف
گەڕەکێک پڕ لە عاشق
کێلگەیەک پڕ لە گوڵەگەنم
شەقامێک پڕ لە مۆسیقار
مەملەکەتێک پڕ لە گوڵفرۆش
پەرستگایەک پڕ لە ڕووناکی

بەهیچ کام لەم ڕێگایانەدا مەڕۆ
یاخی و یاخی و یاخی

گوڵەکەم
بەو ڕێگایەدا بڕۆ
کە تا ئێستا نەماندۆزیوەتەوە
یان بیرمان لێنەکردۆتەوە
دەبڕۆ دەی
دەی دەی دەی
منیش وەک هەمیشە
هەر بەدواتەوەم

**کۆتایی ئۆگستی ٢٠١٣**

# (شەنبا)

گوڵەگیان
وەک دەقێکی شیعری
هەڵموەشێنەوە
ورد ورد
ورد و خاشمکە
نیگایە نەرمەکانم
خەیاڵە خەمۆکییەکانم
خەونە خوناوییەکانم
ئارەزووە ئاورینگییەکانم
هەموو جەستەم
هەڵموەشێنەوە

دواجار
دروستمکەرەوە و
ئمکە بەو مرۆڤەی
پڕ بە حەزەکانی خۆت
پڕمکە لە عەشق
پڕمکە لە ڕووناکی
پڕمکە لە زەردەخەنە
هەڵموەشینەوە
جارێکی تر
بە دەستەکانی خۆت
دروستمکەرەوە
چونکە من نەمدەتوانی لەوە تێبگەم
کە عەشقی تۆ
بەشی هەموو دنیا دەکات
گۆرانییەکانی ناخی تۆ

بەشی سەمای
هەموو تاڤگەکان و
شەپۆلی نێو ئۆقیانووسەکان دەکات
زەردەخەنە گەرمەکانی تۆ
بەشی هەموو باڵندەکان و درەختەکان دەکات
پرشنگی نێو چاوەکانی تۆ
بەشی هەموو ئەستێرەکان و
پەلکەزێڕینە و
تەمە سپیەکان دەکات
ورد و خاشمکە و دووبارە
بە پەنجە ناسکەکانی خۆت دروستمکەرەوە
ممبە لە مەیخانەیەک دامبنێ
تا شیعر بۆ مرۆڤە ونبووەکان بخوێنمەوە
لە تەنیشت نافوورەیەکی کەسک و سۆر دامبنێ
تا سڵاو لە مرۆڤە عاشقەکان بکەم

بمکە بە پەیکەری کوڕ و کچێکی گەنج
دەستیان لەنێو دەستی یەکتری بێ
بمکە بە پەیکەری دوو کۆتر
دەمیان لەنێو دەمی یەکتری بێ
بمکە بە ڕەوە ماسیەکی پرتەقاڵی
هەر بۆ بای هەوەس
بێ مەبەست بێن و بچن
گوڵەگیان هەر خۆت
بە تەنیا خۆت
هەڵموەشێنەوە
نیگاکانم خەیاڵەکانم خەونەکانم
دەمار بە دەماری عاتیفەم
پەنجەکانم
چاوەکانم
ئارەزووەکانم

هەموو جەستەم
ورد ورد / ورد و خاشمکە
لەبەردەم خۆرەتاوی عەشق
شەنەبام پێبکە
دواجار
دروستمکەرەوە و
فێرم بکە
بە زمانی پەپوولە و خاڵخاڵۆکەکان بدوێم
بە زمانی گەڵا شیعر بنووسم
بە زمانی ئاو کچۆڵە نامرادەکان
هێور بکەمەوە
فێرم بکە
لە تریفەی مانگ یاخی نەبم
نیشتیمانم زێتر خۆشبوێ
بە دیار سەرشێتییەکانی ڕەشەبا

خەو نەمباتەوە
چیتر (ماڵەکان نەکەینە زیندانێک بۆ خۆشەویستی )
چیتر تابلۆکانی ژیان
بە ڕەنگە تۆخەکانی تەنیایی تەلخ نەکەین
هەڵموەشێنەوە و ورد و خاشمکە
وەک گوڵەگەنم و وردە گەڵاکان
ڕووت ڕووت / ڕووتم کەرەوە
لە بەردەم خۆرەتاوی ئەڤین
شەنەبام پێبکە
گوڵەکەم
هەر لەوێدا دروستم کەرەوە و
مەهێڵە جارێکی تر
وەکو منداڵیم شەرمن بم
لە نێو خەونەکانم دا نەزیف بم
لە نێو بازنەکانی کات بسووڕێمەوە

مەهێڵە جارێکی تر
بیر لە جەنگ بکەمەوە
خەون بە مردنەوە ببینم
مەهێڵە جارێکی تر
لقی درەختەکان ببڕمەوە
یان نەوێرم
خەونەکانم شیکەمەوە
فێرمکە
دڵم هێندە گەورە بێ
جێگای عەشقی
هەموو مرۆڤێک و
هەموو زیندەوەرێکی تیاببێتەوە
فێرم کە
جوانییەکانی ژیان وەکو خۆی ببینم

جارێکی تر لە مەستبوونی ئاو نەترسێم
فێرمکە
ماڵەکەم پڕکەم
لە گوڵ و لە مۆم و کتێب
یان حیکایەتی حەقیقەتی خۆم
وەکو خۆی بنووسمەوە
فێرمکە
با وەکو تۆ
بێدەنگیم پڕ بێت لە هاوار
مردنم پڕ بێت لە ژیان
تووڕەییم پڕ بێت لە خۆشەویستی
ورد و خاشمکە ئەی شۆخ
لەبەردەم خۆرەتاوی عەشق

شەنەبام پێبکە و
بە دەستەکانی خۆت
دروستمکەرەوە
با وەکو تۆ گەورەبم  و
هیچی تر

**سەرەتای بەفرانباری ٢٠١٤**

# (گەڕانەوە)

ئەی نیشتیمان
گەڕامەوەو لە ئامێزت
لەنێو چاوە سەوزە ئاوریشمییەکەت
خەونێکی سپیم بینی
وەس وەساوی وەکو سەراب
شێواو وەک ڕەشەبا
ئێوارە ئەرخەوانییەکانم بینی
پڕ بوون لە پرسیار
پرسیارەکان
پڕ بوون لە بێهوودەیی

دەگریان
پەڕەکانیان لە بەردەم خۆرەتاو
زەرد هەڵگەڕابوون

قەڵەمەکانم بینی
ڕەنگاو ڕەنگ و جۆراوجۆر
زۆربەیان لەسەرمێزی
بەرپرسە سمێل فشەکان
بە بێبایەخی فڕێدرابوون
لە ئەمنە سوورەکەش
تابلۆی مردن و ژیانم بینی
مردن بە پێکەنینەوە
مەمکەکانی خۆی
لە دەمی ژیان نابوو

گۆیژەم بینی
پیر و پشت کۆم و گۆچان بەدەست
بەدەم  وردبوونەوە لە ئومێدەکان و
شیکردنەوەی خەونەکان
فرمێسک لە چاوەکانی دەهاتنە خوار

هاتمەوە و لەنێو چاوە ماندووەکانت
تیشکێکی نارنجیم بینی
منیش هەروەکجاران
خەیاڵەکانی خۆم
لەسەر سیسەمێکی شین
بە تارایەکی سەوز داپۆشییەوە
وام هەستدەکرد
لەوەتەی هەم هەر کەسێکی ونم
هەر ئەوکەسەم

سیمای نیشتیمانم ناناسمەوە
یان تاهەتا بەم خەیاڵانە دەمێنمەوە
کە / حیکایەتێکم  پڕ لە ترس
گەردەلوولێکم پڕ لە گومان
ئۆقیانووسێکم پڕ لە نیگەرانی
گەڕامەوە و
خەونەکانم تێکەڵاوبوونەوە
لە گەڵ تریفە پرشنگییەکانی  نائومێدی
منیش وەک خەونە بەردەوامەکانی تۆ/ ئەی نیشتیمان
بوخچەیەکم پڕ لە نهێنی و ناکرێمەوە ...!

**هاوینی ٢٠١٣**

# شەڕابێک لە ڕەنگی خۆرەتاو

ئەم شەڕابە چیتر مەستمان ناکات
نامانگەڕێنێتەوە نێو
بنار هەوارگە سەوداسەرییەکانی سەوزایی
یان / کۆڵانەکانی ئاگر
شەقامەکانی بروسکە
پێدەشتەکانی ڕەشەبا
من ئارەزووی شەڕابێکی تر دەکەم
بۆنی ڕەیحانەی لێ بێت و
شین شین / وەک گۆنا خرپنەکانی خودا
زەرد زەرد / وەک سیما فریشتەییەکانی مانگ
شەرابێک لە ڕەنگی خۆرەتا و
سوور سوور / وەک مەمکەکانی هەنار

شەڕابێک لە نێو ڕووبەری ونبوون
دڵفرازم بکا
تۆز و غوباری غەریبیم لێ دا تەکێنێ و
دڵ پڕڕازم بکا
شەڕابێک
سەوز سەوز / وەک پەیکەرە ڕەنگینەکەی گیا
شەڕابێک بە نێو
بەهەشت و ئۆقیانووسەکان و
کەلاوەکانی شەونم و
مەملەکەتی ئەستێران دا بمگێڕێ
شەڕابێک
پشکۆی ئارەزووەکانم گەش بکاتەوە و
ئاشتم بکاتەوە لەگەڵ کچە دراوسێکانم
من چیتر
ئەم شەڕابە ناخۆمەوە

ئارەزووی شەڕابێکی تر دەکەم
شەڕابێک
ماڵە تاریکەکانی تەنیاییم
پڕ بکات لە نوور و
باڵندە و
مرۆڤە نامرادەکانیش بە سەما بهێنێ
شەڕابێک
شیرین شیرین
وەک لیکی نێو دەمی
حۆری و
فریشتە و
شاژنە باڵا زراڤەکانی بەهەشت
شەڕابێک هێندە مەستم بکات
مەست مەست مەست
هێندە مەست

دەمارەکانی عاتیفە و
بوخچەی ئارەزووە ئیرۆسییەکانم
بخاتە سەر پشکۆکانی ئاگر
هێندە مەست
پڕمکا لە شیلەی شادومانی
بۆ جێژووانی
دڵبەرە برینداره‌کەی غوربەتم
کەپرێک لە وشە ڕۆمانسییە چاو بە فرمێسکەکان
دروست بکەم و
ئۆقیانووسێک لە شیعریش
بڕژێنمە نێو کێڵکە تێنووەکانی ژیان ...!

**ئایاری ٢٠١٤**

# لە دەرەوەی ژیان دەژیم

هەموو ڕۆژێ
بە چاوەکانی خۆم دەبینم
مردن
لە نێو کۆڵانەکان پیاسە دەکات
پیاوێکی جاویدانیش
کتێبێکی بە دەستەوەیە و
قووڵ قووڵ
مەست مەست بیردەکاتەوە
یەکەمجاریشە ببینم
ئاو لە ژیان بتۆرێ
باران بەسەرخۆشی بباری

پەپوولەکان بە ڕووتی گۆرانی بڵێن
گەڵاکان بە درەخت و
گیا بە خاک نامۆ بێ
ئەمڕۆ لە جیاتی خۆم
وشەکانی نێو خەیاڵم سەفەر دەکەن
بەنێو تەمە سپییەکانەوە
ڕەت دەبن
لە کوژاندنەوەی مۆمی نێو شیعرەکانم
بێزار بوون
بەدوای پرسیارە گەورەکانی نێو خەونەکان دا
دەگەڕێن
جارجارەش لە نێو هەورە ڕەشەکان دا ون دەبن
ون ون ون
جارێکی تر
بۆ نێو من و شیعرەکانم

ناگەرێنەوە
منیش
لەم پەرتبوونی جەستە و
پەرتبوونی خەون و
لەم ڕووبەری پارچە پارچە بوون و
نیگەرانیەی ڕۆح دا
شیعر دەکەم بە نیشتیمانی خۆم
خۆم نا
تەنیاییم دەگەڕێنمەوە نێو ژیان
لەنێو
بازنە سواوەکانی کات
سەرم دەسووڕێ و
ڕەنگەکانی نێو نیگاری ئارەزووەکانم
ناناسمەوە
لە خەونەکانم بێزار بووم

عەشقیش
ڕۆژ لە دوای ڕۆژ تەنیاترو
تەنگە نەفەسترم دەکات
وەرزەکانم پڕ دەکات لە بێهوودەیی
پیاسەکانم پڕ دەکات لە بیرکردنەوە
بیرکردنەوەکانم پڕ دەکات لە خۆڵەمێش
ئەوە مودەتێکی دوور و درێژە
حیکایەتی شەوە سوورەکانی من
کەرنەڤاڵێکن لە شێتبوون
بۆ خۆم دەڕۆم
لە دەرەوەی ژیان
ماڵێکی تر دروست دەکەم
هاوارەکانم دەتاوێنمەوە لە نێو بێدەنگیم
خەمەکانم پڕ دەکەم لە زەردەخەنە
لە دەرەوەی ژیان

دەگەڕێمەوە نێو بوون
تا هەتایە لە نێو منداڵیم دەمێنمەوە
لە دەرەوەی ژیان
تەنیاییم پڕدەکەمەوە لە هەناسە
تا هەتایە بە تاقی تەنێ
لە دەرەوەی ژیان دەمێنمەوە
دوور لە خۆم و
دوور لە عەشق و
دوور لە ئاوەدانی
بەس دوور لە شیعر نا ...!
لە دەرەوەی ژیان
لەو دیو ڕووبەری نیگەرانی
بەدوای وێنەکانی خۆم نا·
بەدوای پەیکەری بوونم دا دەگەڕێم
لە دەرەوەی ژیان

لەو دیو سنوورەکانی تەنیایی
بە دوای ناو و دەنگی خۆم نا
بە دوای پەیکەری ئارەزووەکانم دا دەگەڕێم
لە دەرەوەی ژیان
لە نێو گەڕەکەکانی ئەو دنیا
ئەفسانەی ونبوونی خۆم دەنووسمەوە
وەکو گەریدەیەکی گەردوونی
هەردەڕۆم و هەردەڕۆم
لەدەرەوەی ژیان
گوێ لە ناڵەی ئەستێرە بێ ئومێدەکان ڕادەگرم
جار جارەش  لە نێو خەونی پەپوولە مێیینەکان دەمێنمەوە
سەرێک لە باخچەی گوڵە تەنیاکان دەدەم
دواجار لەسەر پشتی شەپۆلێکی یاخی
هەردەڕۆم و هەردەڕۆم
دەڕۆم

هەموو کیشوەرەکان و
ئوقیانووسەکان ... جێدەهێڵم
هەموو /
برادەرەکانم
دڵبەرەکانم
کتێبەکانم ... جێدەهێڵم
دەڕۆم / لە دەرەوەی ژیان
شیعر دەکەم بە ماڵ و نیشتیمانی خۆم
لە دەرەوەی ژیان
لە نێو گەرەکە ئارامەکانی ئەو دنیا
بە تاقی تەنێ
لەگەڵ خۆم و
لەگەڵ خەونە شینەکانی نێو شیعرەکانم دا دەژیم

**ئاداری ٢٠١٤**

# تۆ لێرە بمێنەرەوە

تۆ مەرۆ بۆ کەنارەکانی مردن
مەڕۆ بۆ دەرەوەی ژیان
مەڕۆ بۆ گەرەکەکانی تەنیایی
بۆ نێو باخچەکانی بێهوودەیی
تۆ بە نێو ئەو تونێلەدا مەڕۆ
کە دەتگەیەنێتە نێو دوورگەکانی دۆزەخ
یان / گۆڕستانە تاریکەکانی بیابان
تۆ لێرەدا بمێنەرەوە
ئەستێرە ئاوسە ئیرۆسییەکان و
پەپوولە ونبووە پەراگەندەکان بەسەربکەرەوە

یان ئەو مرۆڤانەی خەون بە مردنەوە دەبینن
یان ئەو کچۆڵانەی بیر لە خۆکوشتن دەکەنەوە

تۆ لێرەدا بـمێنەرەوە
کە گەردەلوولی مەرگ هەڵیکرد
ژیان لە ئامێزی خۆت گەرم داپۆشە
دار هەنجیر و سنەوبەرە پیرەکان
هێور بکەرەوە
بڕۆ نێو نیگاکانی
ئەو ژنانەی بەدیار پەنجەرەکانەوە
لە چاوەڕوانی ئەوەن
کەی مێردەکانیان
لە جەنگ دەگەڕینەوە
بڕۆ نێو نیگاکانی
ڕووبارە سەرمەستە سورياليیەکان

کە لە چاوەروانی خۆرەتاو
گۆرانی بۆ تەمە سپییەکان دەڵێن
بڕۆ نێو نیگاکانی
دڵۆپە بارانە دڵتەرەکان
ئەو دەمەی نزیک دەبنەوە
لە پنجە گیا و لە گەڵاو گوڵە ڕووتەکان

تۆ لێرەدا بمێنەرەوە
لەگەڵ من مەیێ
بۆ نێو کیشوەرەکانی ڕەشەبا
بۆ ئەودیو سنوورەکانی بروسکە
یان / ئەودیو پەرێزەکانی تۆفان
تۆ وەکو من نیت
گوڵەگیان
من نەمدەزانی

بۆ هاتووم و
بۆ دەبێ لێرەدا بمێنمەوە
چۆن لەئامێزی شەو ڕابکشێم
یان چۆن /
سەما بۆ سپیدە بکەم
من نەمدەزانی نا
خەونەکانی خاک
بکەمە خەناوکەی گەردنم
شەڕابی شادومانی هەڵبدەم
تۆ لێرە بمێنەرەوە
لێمەگەڕێ
زێتر
جەستە بریندارەکەی
نیشتیمان و پایز
بشێوێندرێ و

جوانییه‌كانیان هه‌تک بكرێن
تۆ لێره‌دا بمێنه‌ره‌وه‌
خه‌مه‌كانی دایكم و
لاوكه‌كانی ڕووبار
له‌ ده‌فته‌رێكدا بۆم بنووسه‌ره‌وه‌
ئازاره‌كانی مانگ و
خه‌ونه‌كانی منداڵێكی پاكه‌تفرۆش
له‌ تابلۆیه‌كدا بۆم ڕه‌سم بكه‌

تۆ لێره‌دا بمێنه‌ره‌وه‌
ژیان له‌نیو چاوه‌كانی تۆ شیرینه‌
سروشت له‌نێو خه‌یاڵه‌كانی تۆ ڕه‌نگینه‌
مرۆڤ له‌نیو بیركردنه‌وه‌كانی·تۆ سه‌نگینه‌
گوڵه‌گیانم
تۆ لێره‌دا بمێنه‌ره‌وه‌

منیش کە هاتمەوە
لەگەڵ خۆمدا
شیعر و عەشق و / پایزێک لە زەردەخەنەت
بۆ دەهێنمەوە ...!

**سەرەتای ئۆگستی ٢٠١٤**

قەسیدەی (من)/ ناومان ناوە (دەقی تەمەن)، بەمانای دەقێکی کـــــــــراوە و بەردەوامە، لەگەڵ تەمەنی شاعیردایە، واتە مەرگی شاعیر دەبێتە دوا دێرو دوا نوختەی ئەم قەسیدەیە.

# (من)

- بەشی یەکەم

١

من کەسێکم
ژمارەی تاکم لە ژمارەی جووت
خۆشتر دەوێ
تاک تاک تاک
تک تک تک
تۆ تۆ تۆ
تۆی تاک و تەنیا
تۆ تا ئەبەد تۆ

٢

من ماڵم لە شووشەیە و
بەردیش
لە ماڵی خەڵکانی تر دەگرم
سەیرەکە لەوەدایە
من بە منداڵیش وابووم
بەردم لە ڕێبواران دەگرت
شووشەی
پەنجەرەی ماڵانم دەشکاند
هێلانەی چۆلەکەکانم تێکدەدا
بەردم دەگرتە
ماڵی ڕەشەبا و بروسکە و تۆفان
تەنانەت
بەردم لە ماڵی خوداش دەگرت

٣

من لە تەیراوە لە دایک بووم
لە نێو شیعرەکانیشم
بە زمانی تەیران دەدوێم
ڕەزی ئومێدەکانیشم پڕن لە ترێ
حەزم لە دەنگی تەمبوور و تاریش نییە
لە تاریکیش
ڕوانینەکانم تیژتر دەبن
تاهەتاش
نامە تەتەری
هیچ تەور بەدەستێک

٤

من ئێستا لەگەڕەکی نائومێدیدا دەژیم
بە کەلوپەلەکانی عەشق ماڵێکم پێکهێناوە
لە ژوورێکدا تابلۆی دۆڕانەکانی خۆمم هەڵواسیوە
لە ژوورێکی تر / تابلۆی ترس و نیگەرانیەکانم
لە ژوورێکی تر / تابلۆکانی مردنم
لە ژوورێکی تر / تابلۆکانی تەنیاییم
لە دوواهەمین ژووریش وا خەریکم
هێدی هێدی
تابلۆکانی خۆکوشتنم هەڵدەواسم

٥

لە نێو خەڵوەتگەی ژینی من
ژنێک سەرسامە بە پەنجەکانم
ژنێک سەرسامە بە قژی خاوم
ژنێک سەرسامە بە سمێڵی سوورم
ژنێک سەرسامە بە نیگاکانم
ژنێک سەرسامە بە شیعرەکانم

سەیرەکە لەوەدایە
لەنێو ئەو هەموو ژنە سەرسامانەم
منیش سەرسامم بە خۆم
هەر خۆم و هەر خۆم و هەر خۆم
خۆمی تاک و تەنیا
خۆم تا ئەبەد خۆم

٦

من وام
هەموو شەوێ لە ئامێزی
کچێکی گاوردام
کەچی وا تازە بە تازە
( شێخی سەنعانەکانی لای خۆمان
خەریکن و دەیانەوێ
بۆ کچانی گاور لە ئیسلام وەرگەڕێن )

٧

من سەردەمانێک
وامدەزانی
بەهەشت لە ژێر پێیەکانی دایکم نا
بەهەشت لەژێر پێیەکانی مندایە
دواتر هەر خۆم
تەنیا و تەنیا و تەنیا
خۆم لە نێو
ڕووبەرە قووڵ قووڵەکانی
دۆزەخ بینییەوە

٨

من وام
ئەو ژنەی خۆشم دەوێ
چاوەکانی لە گەڵاو
لێوەکانی لە ئاوریشم و
مەمکەکانی لە هەور و
پەراسووەکانی لە با و
پەنجەکانی لە گیا و
ئەنگوستیلەکەی لە سەدەف و
ملوانکەکەی لە ڕەیحانە و
حەزە ئیرۆسیەکانیشی لە ئاگرن

٩

هەر ئەو ژنە
هەموو شەوێک
دێتە نێو خەونەکانی من
باڵای بەرزە وەک پنجەگیا
دڵی نەرمە وەکو بەرد
قژی ڕەشە وەکو لم

چاوەکانی سەوزن وەکو مانگ
خەیاڵەکانیشی سپین وەکو خەڵووز

## ١٠

من وام
گەر عەشق لە من بستێننەوە
لە تیاترۆخانەکاندا بەدوای مندا بگەڕێن
گەر دڵبەرەکەم لەمن بستێننەوە
لە ئەشکەوتەکاندا بەدوای مندا بگەڕێن
گەر دایکم لەمن بستێننەوە
لە گەڕەکی گەڵایە چاوڕەشەکاندا بەدوای مندا بگەڕێن
گەر قەڵەم لەمن بستێننەوە
لە بیابانەکاندا بەدوای مندا بگەڕێن
بەڵام ،
گەر شیعر لەمن بستێننەوە

ماڵێکم نابێت بۆ ژیان و
لە گۆڕستانەکاندا بەدوای مندا بگەڕێن

١١

لە نێو دەفتەری بیرەوەریەکانی من
ژنێک ژنێتی خۆی تیرۆر دەکات
ژیان ژان دەیگرێ و
نیشتیمانیش پڕ دەبێت لە بۆنی بخوور
ژنێکی تر دڵی شاعیرێک دەشکێنێت
ژیان بێهوودە و هەڵوەدا دەسووڕێتەوە و
نیشتیمانیش پڕ دەبێت لە بورکان
ژنێکی تر یاخی دەبێت
لە هەموو ئایدیۆلۆژیاکان و ئیزمەکان
ژیانیش کەمانجەکەی دەخاتە سەرشانی و
لاوکی عەشق و بەختەوەری دەژەنێ و

نیشتیمانیش پڕ دەبێت لە گوڵ

## ١٢

من وام
بە کانی هیچ قەدەرێک
تینوێتی خۆم ناشکێنم و
ئاویش بە هیچ ئاگرێکدا ناکەم
ئاخر من هەمیشە
لەسەر پشتی شەپۆلەکان
بۆ ئاگر دەڕوانم
زۆرجارانیش
لە نێو بڵێسەکانی ئاگر ڕادەکشێم و
شیعر
بۆ شەپۆلە پرشنگییەکان و
بۆ بارانە پاییزییەکان دەنووسم

١٣

من لە هیچ کەسێکی تر ناچم
لە خۆم نەبێت
بۆیە
لە نێوان من و نووسەرێکی خۆفرۆش
قەڵەمێکی سەرکەش هەیە
لەنێوان من و سەرکردەیەکی درۆزن
نیشتیمانێکی بریندار هەیە
لە نێوان من و ژنە عاشقێکی دۆڕاو
خەونێکی سپی سپی هەیە ..!

١٤

من درێژکراوەی
ئەو ڕۆژگارە ساکارانەم
کە لەبەر سێبەری
کەلاوەیەکی گەڕەکەکەمان
لەگەڵ کچانی دراوسێ
ساپساپانێمان بە ساتەکانی تەمەنمان دەکرد
خەمە خۆڵەمێشییەکانیشمان بەبا دەدا
بۆیە ئێستا
بووم بە کەسێکی ئیرۆسی و
خەونە سوریالیەکانیشم پڕن لە سێو

## ١٥

من وام
لەوەتەی هەم
فڕینە ڕۆمانسیەکانم
لە نێو تەمێکی سپی کۆتاییان دێ
ژووانە شەو درەنگانەکانم
بە نەزیفبوون کۆتاییان دێ
ساڵەکانی نێو سەدەکانی غوربەتم

بە ئاوسبوون کۆتاییان دێ
هەموو قەسیدە درێژەکانم
بە زەردەخەنەیەکی منداڵیم کۆتاییان دێ
لاوکی بە عاشقبوونەکانم
بە شێتبوون کۆتاییان دێ
بەڵام تا ئێستا
ئەو هاوکێشەیەم بۆ شینەبۆتەوە
کە دوادێڕەکانی
ڕۆمانەکەی تەمەنی ( ناڵە حەسەن )
بە کام ئافات و
بە کام میلۆدی و
بە کام حیکایەت کۆتایی دێ ..!

**تەمموزی ٢٠١٢**

## بەشی دووەم :

١

من هەموو ئاوێنەکانم تاقیکردەوە
ئاوێنەی عەشق
ئاوێنەی مانگ
ئاوێنەی پایز
ئاوێنەی باخچە
ئاوێنەی ئاو
لە هەر هەموویاندا
خۆم تەڵخ و شێواو و نابووت بینی
منی ڕۆح پەپوولەیی و خەیاڵ لێوانلێو لە گوناە

ئیتر دەبێ چاوەڕێی چیتر بم لە ئاوێنەکان
بۆیە ئێستا من ڕقم لە خۆم نا
ڕقم لە هەموو ئاوێنەیەک دەبێتەوە

٢

من هەموو غەریزەکانی نێو ناخی خۆمم تاقیکردەوە
جلەوی تەنیایی خۆمم تەسلیم بە هەموویان کرد
غەریزەکانی ئیرۆسیم لە هەموویان
میهرەبانتر و گەرمووگوڕتر و
لە هەموویانەوە پتر لە خۆمەوە نزیک بوون

٣

من لە هەموو دەرگاکانی عەشقم دا
لەو سەرەوە
دڵشکاو و نامواد و بێئاکام هاتمە دەرەوە

دەکرێ ئێستاش ناوم بنێن
دۆڕاویترین عاشقی دنیا

٤

ئەو ڕۆژەی من تیا لە دایک بووم
هەر هەمانڕۆژ
ئەستێرەیەکی ئیرۆسی هاتۆتە دنیا
لەو چرکەساتەش کە ژیان جێدەهێڵم
هەر هەمانکات
ئەستێرەیەکی سۆزانی دووگیان دەبێت
وای پێگوتم
پیاوە سپیە نوورانیەکەی نێو خەونەکانم

٥

من کە دەڕۆمە کەنار دەریا
نیگاکانم پێم دەڵێن
ئارامی ئاو
لە ئارامی ئەویندارەکەم دەچێ
ئەو
ئاو
ئەوین
ئاو هەمیشە ئەو
ئەوین هەمیشە ئەو
ئەو هەمیشە ئەو

٦

من حەزدەکەم
هەموو ژیان لەنێو تۆدا بتوێتەوە

تۆش لە نێو من
من حەزدەکەم
تۆ لە هەموو مەخلوقاتێك ئاسوودەتر بیت
منیش لە تۆ

٧

من لە نێوان
گۆزەیەک پڕ لە شەراب و
گۆزەیەک پڕ لە شەونمی عەشق و
گۆزەیەک پڕ لە لیکی سۆز
سێیەمینیان هەڵدەبژێرم
من وام
سۆز دەمگەیەنێتە نێو
ڕووبەرەکانی ئیرۆس

٨

من کەسێکم
هەمیشە
ڕابردووی خۆمم لەنێو
چارۆگە ئاوریشمییەکەی ئایندەم
لوولداوە
بۆیە ئێستا
ئایندەم بە دیار
جەستەی ڕووتی ڕابردوومەوە
شمشاڵ لێدەدا

٩

من گەر تەنها سێ ڕێگەم لەبەردەم بێ
لەم سێ ڕێگایەش تەنها یەک شانسم هەبێت
ڕێگای یەکەم :
گەر کچێکی نەشمیل و جوان
دوگمەی سوخمەکەی کردبێتەوە و
بەزەردەخەنەیەکی ئیرۆسییانە چاوەڕێم بکا
ڕێگای دووەم :
گەر کەسێک مەدالیەکی زێڕینی بەدەستەوە بێ
بیەوێ لە سینگمی بدا
ڕێگای سێیەم :
گەر نیشتیمانە غەریبەکەم

بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە
باوەشی بۆم کردبێتەوە و بانگم بکا
بەبێ هیچ شک و گومانێک

گورج گورج
بەرەو نیشتیمانەکەم دەڕۆم
دەڕۆم و بە ئارامی لە باوەشیا ڕادەکشێم
ڕادەکشێم لە باوەشیا ، تا خەون بینین ...!

١٠

ڕۆژی لە دایکبوونی من
لەو کاتەوە دەست پێدەک
کە مۆمی هەموو خوداکانم
لەنێو دڵ و لەنێو بیرکردنەوەکانی خۆم
کوژاندەوە
خودای ئاسمان
خودای زەوی
خودای ناو کتێبان

هەر هەموویانم یەکبەدوای یەک
لە نێو دەمار بە دەماری خەیاڵ و جەستەم
ڕەشکردنەوە

١١

من ئەوەم دەزانی
تۆ هەموو پایزانێک دەهاتیەلام
شەوانان
نەرم نەرم و شل شل
بە شیلە شادومانیەکانی شەهوەتت
جەستەمت دەشێلا
یان زستانان
لە کونجی ماڵەکەت دەمایتەوە و
نامە بارانت دەکردم

یان هاوینان
لە کەنار دەریایەک
ڕووت ڕووت ڕادەکشایت و
لە چاوەڕوانیم ڕادەمایت
یان بەهاران
لە ژووانەکانی بەر باران
خۆت بە باڵام دەنوساند
تا تەڕ دەبووین
تەڕ تەڕ تەڕ
بەڵام ئێستا
نە شێلانی شەوانان و
نە نامە ئاگراویەکان و
نە چاوەڕوانییە ئیرۆسییەکان و
نە ژووانە بەربارانییەکان و

نە پایز و
نە زستان و
نە بەهار و
نە هاوین
هەموویان بوون بە خەونێکی خۆڵەمێشی
هەر دەڵێی ،
بە بێ وەرز و
بە بێ تەرزە و
بێ توانەوە و
بە بێ ترپە ترپی دڵە ژیانی من

## ١٢

من کە دەچمە نێو تەمەنەوە
تەمەنی شیعریم نا ، تەمەنی خۆم
وا هەستدەکەم

لە ژیان دوور دەکەومەوە
دوور دوور دوور
من کە دەچمە نێو تەمەنەوە
تەمەنی خۆم نا ، تەمەنی شیعریم
وا هەستدەکەم
لە ژیان نزیک دەبمەوە
نزیک نزیک نزیک .

## ١٣

سنووری نێوان من و نیشتیمان
وەک سنووری نێوان
من و شیعر وایە
بۆیە کە باسی خۆم و نیشتیمان دەکەم
خەون ڕادەچڵەکێ
یان کە باسی خۆم و شیعر دەکەم

عەشق ڕادەچڵەکێ
یان کە باسی خۆم و مردن دەکەم
ژیان ڕادەچڵەکێ

## ١٤

من بە نێو ڕەنگەکانی باران و
ڕەنگەکانی با و
ڕەنگەکانی پایز و
ڕەنگەکانی ئاگرو
ڕەنگەکانی جەستەی تۆدا پەرتبووم
تۆش بەنێو ڕەنگەکانی نێو خەونەکانی من
من هێندەی دەکەم
نە خۆم بۆ کۆ دەکرێتەوە نە تۆش
نەدەستم بە مەمکی خەونەکانم ڕادەگات
نە مەمکەکانی تۆش

## ١٥

زۆر بە سادەیی دەتوانم پێتبڵێم
تۆ منت ئاشنا کرد بەخۆم
تۆ منت ئاشنا کرد
بە نیگارە ئەبستراکتەکانی عەشق
بە ئیرۆسیەتی ڕەنگەکان
بە فرمێسکەکانی خۆرەتاو
بە گوڵە ڕەشەکانی بەفر
بە سەرمەدی سنەوبەرەکان
بە سەمفۆنیای شەودرەنگانی ئاو
بە زمانی باڵندەکان
بەڵام تەنها شتێک کە نەتتوانی
من ئاشنا بکەیت بە خۆت ...!

سەرەتای ئۆکتۆبەری ٢٠١٣

## بەشی سێیەم :

### ١

من لە نێو پایزێکی نێو چاوەکانی تۆ
دەمەوێت هەموو وەرزەکانی جەستەت گەمارۆ بدەم
من لە ژێر کەپرێکی بنار مەمکۆڵەکانی تۆ
دەمەوێت هەموو کەنار دەریاکانی گەردوون گڕبدەم
کە عەشق لەنێو خەونەکانێ تۆ هێندە نیشتیمانێکی گەورە بێت
ئیدی بۆ دەبێت
من تاهەتا
لە دووری تۆ و لە دووری نیشتیمانەکەم دا بسووتێم

٢

من لە ژیان بۆ هیچ شتێک ناچەمێمەوە
تەنها مەمکەکانی تۆ نەبێ
بۆیە تا مردن
خۆم بە مورید و
ئەسیری جەستەی تۆ دەزانم

٣

من تەمەنی خۆم کردە مۆمێک و
لەنێو مەمکۆڵەکانی تۆم داگیرساند
هەموو تێکستە ئیرۆسییەکانی خۆم
لەسەر جەستەی تۆ نووسییەوە
تۆش ژیانی منت لە نێو
ژوورە تاریکەکانی مردن جێهێشت و

چاوەکانمت پڕ کرد
لە ئەستێرە زەرد و سوورەکانی بێهوودەیی

٤

ڕەشبینی من
لە ڕەشبینییەکەی بەفر دەچێت
کاتێک
بیر لە خۆم و بیر لە خەونەکانم و
بیر لە ژنە ڕەشپۆشەکەی
نێو شیعرەکانم دەکەمەوە

٥

بە بڕوای من
ڕەگی شیعر دەچێتەوە سەر
بنەچەی جوانییەکانی تۆ

بۆیە
هەمیشە و هەمیشە و هەمیشە
زەردەخەنەی سەر ڕوخسارت
منی شاعیر مەست و حەیران دەکا

٦

من بە پرشنگە مێیینەکانی خەیاڵت
نیشتیمانی نێو شیعرەکانم دەڕازێنمەوە
بە مۆرفیمە نارنجیەکانی نێو خەونەکانیشت
بوونم پڕ دەکەم لە تۆ

٧

من بە مەسکارا و قەڵەمی لێوە ناسکەکانی تۆ
چەندین دیوانە شیعرم نووسییەوە و
کەپرێکیشم

لە وشە ئیرۆسییەکانم بۆت دروست کرد

٨

ئەی مەریەمی مورادەکانم
من و ئەم گەردوونە
پیربووین بە میلۆدییەکانی مردن
دە بەم کەمانجەی
پرچە خەنەییە ئاوریشمیەت
ئاوازێکی نوێمان بۆ بچڕە

٩

ژیان لە ژوورەکەی من
لە گۆشەیەکدا
بە گرمۆڵەیی پاڵکەوتووە
لەو ئێوارەیەش

کە بۆنی مردنی لێدێ
ستیانەکەی
بە تەنافی بێهوودەیی
هەڵدەواسێ

١٠

من ئایندەی خۆم و ئومێدەکانم
بە تۆ بەخشی
تۆش لیمۆیە سەوزەکانی ئارەزووەکانی خۆت
من هەموو ژیانی خۆم تەسلیم بە تۆ کرد
تۆش مشتێ لە خۆڵەمێشی خەمەکان و
چەند پایزێکی
نێو باخچەکانی عەشق و هیچیتر

## ١١

دڵۆپ دڵۆپ
لەسەرگۆنات
دەڕژێمە نێو کۆشی خەونەکانت
ڕانەکانت تەڕ دەکەم
بە خەیاڵە گەرمەکانم
هەموو جەستەت دەکەمە ئاو
دەتشۆمەوە بە شەونم
تا تێکەڵ بە خاک ببیەوە
دووبارە
وەک کولیکە سوورێکی چاو ڕەش
سەردەربێنیەوە
لەنێو پێدەشتەکانی دڵی من

## ١٢

من بە هەر ڕێگایەکدا دەڕۆم
لە سەرەوە دەگەمەوە
نێو
کێلگەکانی مردن و
باغەکانی بێهوودەیی
دەزانم لەنێوان من و تۆش
سەبەتەیەک
لە نهێنیەکانی عەشق هەیە
لەگەڵ ئەوەش
مەرج نیە هەموو جارێک
من و تۆ
بەهەمان ڕێگادا ڕێ بکەینەوە

## ١٣

من هەموو جوانی
نێو سروشتی
خەونەکانی خۆم
بە تۆ سپارد
دەتۆش
لاولاوەی خەونە سپیەکانت
سپییێتی لاولاوەی خەونەکانت
خەونە سپیە لاولاوەییەکانت
بەمن بسپێرە ئەی شۆخ

## ١٤

من ماڵێکم لەنێو هەورە
ماڵێکیشم لەوبەر دەریا
من بە جەستە
لەنێو کۆڵانەکانی ئەستێرەم
بە ڕۆحیش
لەنێو شەقامەکانی گژووگیا
بە خەیاڵ
لەنێو سەهۆڵبەندانی غوربەت
بە خەونیش
وام لە ئامێزی
بروسکە و گەردەلوول و ڕەشەبا

## ١٥

من من من
تۆ تۆ تۆ
ئەوە چی بوو
هەر نەبڕایەوە
ئەم چیرۆکی مردنی من و
ئەم ڕەشبەڵەک و
بە کەعبە بوونی عەشقەی تۆ ؟!

**کۆتایی فێبروەری ٢٠١٣**

**بەشی چوارەم :**

١

من بە منداڵی
هەموو جارێک
خەونم
بە کچێکی دراوسێمانەوە دەبینی
کە گەورەش بووم
کچە دراوسێکەم کردە ملوانکە و
لە گەردنی شیعرەکانم کرد
بۆیە هەموو شیعرەکانم
بۆنی خۆلی پاش بارانی
گەڕەکەکەمانی لێدێت

٢

من کەسێکم لە منداڵیەوە
سواری پشتی شەپۆلەکانی عەشق دەبم
بۆ هەمیشەش حیکایەتێکم پڕ لە شکست

٣

لە نێو گەڕەکی ئارەزووەکانت تەنها ماڵێک
لەنێو ماڵی خەیاڵەکانت تەنها ژوورێک
لە نێو ژووری دڵە ئەفسووناویەکەت تەنها گۆشەیەک
لە نێو گۆشەی ئومێدەکانت تەنها سەرخەوێک
لەنێو سەرخەوێکی نێو باوەشت تەنها خەونێک
لەنێو خەونێکی ئیرۆسیت تەنها نامەیەک
لەنێو نامە ڕەنگینەکەت تەنها بۆم بنووسە
گوڵە گیان من تا ئەبەد تۆم خۆشدەوێ

٤

من لەنێو تەنیایی خۆمدا
هەموو شتێکم بیرچۆتەوە
شەقام و کۆڵانەکانی عەشق ناناسمەوە
وەرە و دەستم بگرە
وەکو جاران
مەملەکەتی عەشقم پێ نیشان بدەرەوە

٥

دەوەرە دەی
دەی
دەی دەی دەی
دەی
لەگەڵ خۆتدا
بم بەرەوە

٦

وەرە
ﮔمکە بە تابلۆیەک
لە ژووری نووستنت
لە بەرامبەر خۆت هەڵمواسە
پڕمکە لە ڕەنگی
سووری ستیان و
ڕەشی برژانگ و
مۆری قردێلە و
زەردی ملوانکە و
سەوزی چاوەکانیشت

٧

خەون عەشق خەون
عەشق خەون عەشق
خەون عەشق خەون
من
هەمیشە
خەون
بە تۆوە دەبینم

٨

عەشق
عەشق خەون عەشق
عەشق
من
لە نێو

خەونەکانم
وەکو تۆ
هەر خوێنم لەبەر دەڕوا

٩

من لە زمانی
خۆڵەمێش و بروسکە و مەرگ
تێناگەم
وەرە
بمگەڕێنەوە
نێو
حیکایەتە سەرەتاییەکانی عەشق

١٠

ژیان دوور لە تۆ مردنە
دوور
لە
نیشتیمان
دۆزەخە ژیان بە بێ تۆ

١١

من نە ماڵم هەیە
نە نیشتیمان
نە ئەستێرەیەکم هەیە نە مانگ
لە نێو
سێبەری خۆت
جێگایەکم بۆ بکەرەوە
تەنها خۆم و

دەفتەرێک
پڕ لە یادەوەری خەمناک و
نیگایەک پڕ لە خەونی سپی و هیچیتر

## ١٢

دوورگــەی نێو مەمکۆڵەکانــی تۆ دەکەم بەماڵی خۆم

نێو هەر

هەناسە تۆ خۆم

گەرمەکانی تۆ تۆ تۆ تۆ هەر

تۆ تۆ خۆم

دەکەم تۆ هەر

بە تۆ تۆ خۆم

نیشتیمانی تۆ هەر

خۆم تۆ بــە تـەنیـا لەگەڵ خۆم

## ١٣

من نامەوێت

بەر لە تۆ بمرم

بۆیە تاهەتا

لە نێو دڵە نارنجیەکەم

بەندت دەکەم

## ١٤

من ئەو پێدەشتەم
بۆ تێپەڕبوونی
ڕووباری ئارەزووەکانی تۆ
بەسەرمدا
هاتوومەتە بوون

تۆش لە بەرابەردا
سەمایەکی سوریالی و
چەند ماچێکی تەڕم
پێ ببەخشە و هیچیتر

## ١٥

من من من من من من من من من
من به من
من تەنیا لەگەڵ من
من تۆ من
من من من من من من من من من

**سەرەتای ئەپریلی ٢٠١٣**

## - بەشی پێنجەم

١

من ئێستا بە ڕێگایەکدا دەڕۆم
کەتا دوێنی پێیدا نەڕۆیشتبووم
بیر لە کەسێک دەکەمەوە
کەتا دوێنێ بیرم لێنەکردبوویەوە
خەون بە مەراقێکەوە دەبینم
کە تا دوێنێ خەونم پێوە نەبینیبوو
چ دونیایەکی بێهوودەیە
کە خۆم ئێستاکە نازانم

بە کام ڕێگادا دەڕۆم و
بیر لە کێ دەکەمەوە و
خەون بە چ مەراقێکەوە دەبینم !

٢

تۆ لە شەوێکی بێپەروا
لەنێو ئەشکەوتی تەنیایی من
گوتارێک دەنووسی
لەسەر مردنی عەشق
لەگەڵ سەدەها عاشقانی تر
کە پەناگەیەک
یان ژێرکەپرێک شک نابەن
بۆ ژووان و ئاوێزانبوون و سەما

٣

تۆ جوانیەکانی خۆتم پێ ببەخشە
منیش شیعر
تۆ لە بەستەڵەکیترین شەوانی غوربەت
گەرمم کەرەوە
منیش ئیرۆسیترین خەونی خۆمت
پێ دەبەخشم

٤

ڕەنگی تریفەی مانگی
شەوەکانی من
لە ڕەنگی تریفەی مانگی
نێو چاوەکانی تۆ دەچن
زەردەخەنەی سەر ڕوخساری
پایزەکانی تەمەنی من

لە زەردەخەنە خەمناکەکەی
سەر ڕوخساری تۆ دەچن
لە نهێنی ئەم حیکایەتەش تێناگەم
کە بۆ هەر کیشوەرێکی عەشق سەفەر بکەم
لەو سەرەوە
لە نێو ماڵە ئاوریشمیەکەی باوەشی تۆ
خۆم دەبینمەوە

٥

من ماڵێکم لە مەملەکەتێکە
کە نازانم چ کیشوەرێکە
ماڵێکیشم لە نێو دەریایەکە
کە نازانم چ ئۆقیانووسێکە
ماڵێکیشم لەسەر ئەستێرەیەکە
کەنازانم لە چ شەوێکی تەمەنم دەردەکەوێت

ماڵێکیشم لە غوربەتە
کە نازانم کەی لێی ڕزگارم دەبێت
بەڵام زۆرباش ئەوە دەزانم
کە ڕۆژێک دەگەڕێمەوە ماڵەکەی نیشتیمانم
هەر لەوێدا
دوادێری قەسیدەی ( من ) ی ( دەقی تەمەنم )
دەنووسمەوە و
دوای هەڵکێشانی هەناسەیەکی قووڵ
هەر لەوێشدا سەردەنێمەوە

٦

هەولێر
حیکایەتێکە پڕ لە یادەوەری و
بێشکەیەکە پڕ لە بەرائەت و جوانی

٧

ئەی عەشق
کە نیشتیمانی من
بەهەشتێکی ڕاستەقینە بێت
ئیدی چ پێویستیم
بە بەهەشتی خودا هەیە

٨

وەک چۆن باڵندەکان دەفڕن
منیش حەزم لە فڕینە
وەک چۆن ڕەوەندەکان کۆچ دەکەن
منیش حەزم لە کۆچە
بەڵام ئەمجارەیان کۆچ بەرە و
ڕووبەرێکی نادیار و مەملەکەتی غوربەت نا
کۆچ بەرە و ئامێزی نیشتیمانە ئەبەدیەکەی خۆم

## ٩

هەموو شەوێ
بەر لەوەی بخەویت
دەنکە ترێیەکی ڕەش
لەنێو مەمکۆلەکەت دابنێ و
بە بزەیەکی گەرمەوە
چاوەڕێم بە

## ١٠

وەرە با هەردووکمان بگەڕێینەوە
بەڵام / من بەر لە تۆ
یان با هەردووکمان خۆمان بکوژین
بەڵام / تۆ بەر لەمن
یان با هەردووکمان زیندانی بین
بەڵام / تا ئەبەد بەیەکەوە

## ١١

زەمانێکە
بێهوودەیی پیاسەم لەگەڵدا دەکات
مردن دەملاوێنێتەوە
نائومێدی وەکو سێبەر بە دوامەوەیە
تەنیاییش هەموو شەوێ لەگەڵمدا دەخەوێ
ژیانیش لە دووری دوورەوە
بزەیەکم بۆ دەکات و پێمدەڵێ
دانبەخۆت دا بگرە
خەونەکانی غوربەتت خۆش
ئەی /
کوڕە شاعیرە ڕۆژهەڵاتییەکە

## ١٢

تا قووڵتر بیر لە عەشق دەکەمەوە
ئەم سەفەری هاتنەم بۆ نێو ژیان
جوانتر و ئیرۆسیتر دەبێت

## ١٣

هەموو شەوێک
کە مانگ هەڵدێ
من لە بالکۆنی شیعرەوە
بیر لە تۆ دەکەمەوە

## ١٤

هێندەش لە ئەستێرەکان
ڕادەمێنم

تا حەسرەتەکانم
تێکەڵ بە جوانییەکانی
جەستەی تۆ دەبن

١٥

کە ئەوجارە
هاتیەوە لام
هیچ دیاریەکم بۆ مەهێنە
جگە لە شووشەیەک شەڕابی
لیکی نێو ئارەزووەکانت و
هیچیتر

جونی ٢٠١٣

- بەشی شەشەم :

١

دەکرێ تا ئەبەد
باران بەسەر کێڵگە تینووەکەی
ڕۆحی مندا نەبارێ
یان لەنێو سروشتی ژیانی من
بەهار نەبێ
یان نە ماڵێکم هەبێ و
نە هیچ شوناسێک
بەڵام هەرگیز ناکرێ
لەنێو پایزی عەشق و
لە نیو خەون و شیعرەکانم
من تۆم نەبێ

٢

من جەستەی تۆ
لە شەونم هەڵدەکێشم
جەستەی خۆشم لە ئاگر
کەپرێکت لە پەراسووەکانم
بۆ دروست دەکەم
ملوانکەیەکیش لە ماچ

٣

من پەنجەکانم هی خۆمن
چاوەکانم هی خۆمن
سییەکانم هی خۆمن
بەڵام دڵم نا

٤

ژیانی من
لە دۆزەخ شیرینتر و
لە هەنگوین تاڵترە

٥

شیعری من
لە سێبەرم سپیتر و
لە منداڵیم لاسارترە

٦

عەشقی من
حیکایەتێکە
لە نووری خوا
سەرسامترە

٧

من وەک خۆم
لە تۆ وە نزیکم
وەک تۆش
لە خۆمەوە دوور

٨

بەیەکەوە ڕۆیشتین
ئاوڕمان لەسەرەتا نەدایەوە
سەرەتا تاکۆتایی بە دوامانەوە بوو
کۆتاییمان گەڕاندەوە سەرەتا
دواجار سەرەتامان
لە پێش کۆتایی بەجێهێشت

٩

هاتم بۆ لات
تا پێت بڵێم
دەڕۆم و ماڵئاواییت لێدەکەم
کە هاتم بۆ لات لەنێو ماڵئاوایی
لە لای تۆ مامەوە و
ماڵئاواییم کردە کەپرێک و
لە ژێریدا پاڵکەوتم

١٠

من هەموو جارێک
لە سێشەممەی نیگەرانییەکانم ڕادەکەم
دەڕۆمە نێو
پێنجشەمەی خەونەکانم

لەوێدا کە پڕدەبمەوە
لە زەردەخەنەکانی عەشق
دەگەڕێمەوە نێو ڕۆژەکانی تەمەن

١١

من هەموو جارێک
لە دیسەمبەرەکانی مردنم ڕادەکەم
دەڕۆمە نێو
بەفرانبارەکانی بەرد
لەوێدا کاتێک
عەشق وەقسان دێتەوە
دەگەڕێمەوە نێو مانگەکانی ژیان

## ١٢

تۆ لەوەتەی هەی
منت لەنێو
ژووری دڵت بەند کردووە
منیش لەوەتەی هەم
وا هەست دەکەم
ئازادترین مرۆڤم

## ١٣

من بە حەوت ڕۆژانی هەفتە
تێرنابم لە عەشقی تۆ
من حەزدەکەم
هەشت شەممە و
نۆشەممەش بێمە لای تۆ

## ١٤

ئەو دارەی بۆ یەکەمینجار
لە ژێریدا
من تۆم ماچ کرد
ئێستا کردوومەتە
بە ماڵ و
بە نیشتیمانی خۆم
من لە جیاتی تۆ بم
ئەو دارەی بۆ یەکەمینجار
لە ژێریدا
تۆ منت ماچ کرد
دەیکەم بە ماڵ و
بە نیشتیمانی خۆم

## ١٥

ئاوازێکی سێرنادایی
لەنێو جەستەی تۆدایە
من بەو ئاوازە نەبێ
هێچ شەوێک
ناچمە نێو
باوەشی خەو

**جونی ٢٠١٣**

**بەشی حەوتەم :**

١

دڵی من پڕە لە عەشق
دڵی تۆش پڕە لە مەکر
ماڵی من پڕە لە نیگەرانی
ماڵی تۆش پڕە لە ماسک
وا باشترە من و تۆ
هەریەکەمان
بۆ ئەو ئەستێرەیە
بگەڕێینەوە
کە لێیەوە هاتووین

٢

پەنجەرەیەک
بۆ ڕامان نا
بۆ بێهوودەیی تەنیاییم
بارانێک
بۆ تەڕبوونەوەی
کێڵگەی خۆزگەکانم نا
بۆ ئارامبوونەوەی بێداریم

٣

دەستەکانی من
سوورە
بە خوێنی خەون
دەستەکانی تۆش
بە خوێنی عەشق

ئیتر من و تۆ
چی ماوە تا بۆی بژین ؟

٤

ئەو کچەی
دوێنێ لە کۆڵان
گەمەی لەگەڵ دەکردم
ئەمڕۆش عەشق و
بەنیازە سبەینێش
کفنەکەم
بە دەستەکانی خۆی بدوورێت

٥

ئێمە عەشقمان کرد
بۆ ئەوەی نەمرین

ئێمە نەمردین
بۆ ئەوەی عەشق بکەین
کەچی لەنێو
پایزی عەشق و
بەهاری مەرگ
ئێمە سەفەری ئەبەدیمان
هەڵبژارد

٦

ئێمە نامرادانە
پەنجەرەکانمان بەدەم ڕوانینی
ئەستێرەکانەوە داخست
کەچی
ژیان هەر بەردەوامە و
شەپۆلەکانیش سەرمەستانە

سروودەکانی خۆیان دەچڕن

٧

کاتێک بەهاکانی جوانی
لە مرۆڤ و
لە پێکهاتە پیرۆزەکانی ژیان
دادەچۆڕێت
ژیان بە شێوەیەک پەرت دەبێت
کە نە شیعر و نە عەشق
ناتوانێت کۆیبکاتەوە

## ٨

لە نێو بالکۆنەکانی کات
گوڵێکت بۆ جێدێڵم
لەنێو چاوەکانی مانگ
ئەلبومی وێنەکانمان

لەسەر گەڵاکانی پایز
شیعرێکی ئیرۆسییانە و
لەنێو دڵی خۆشم
هەموو ژیان

## ٩

ئێمە ئاسمانمان پڕکرد لە دووکەڵ
مەرگمان کردە شوناسی عەشق
بارانمان نامۆکرد بە باخچە
ماسیەکانمان لە ئاو تۆراند
خۆشمان سەرگەردان و بێهوودە
چ وەختێکی ناوەخت بوو
بۆ هاتنە نێو ژیان ...؟!

## ١٠

کە تۆ
لە نێو دڵی مندا نەمایت
هەموو جوانییەکانی ژیان
نەیانتوانی
بزەیەک بهێننە سەر ڕوخسارم
ڕووبەری هەموو کیشوەرەکانی دونیا
نەیانتوانی
جێگای تۆ لەنێو دڵم پڕ کەنەوە

## ١١

بەرد لە نێو شیعرەکانی من
دێتە قسە
بێهوودەیی خۆی دەگێڕێتەوە و
عەشقی
بەفر و باران و کڕێوەیە

عەشق لەنێو شیعرەکانی من
دێتە قسە
خەونەکانی خۆی
بۆ نیشتیمان باس دەکات
تامەزرۆی
ماچە فێنکەکانی
ئاگر و تریفە و کازێوەیە

## ١٢

پەپوولەیەکی سپی
بۆ تاهەتا
لەنێو خۆم و سێبەرە شینەکەم
دەمێنێتەوە
ڕووبارێکی پڕ لە شەپۆلی مەنگیش
هەموو شەوێک
ڕێنووسە نارنجییەکانی

نێو دەفتەری بیرەوەریم
کاڵ دەکاتەوە

## ١٣

ژیان لە نێو شیعرەکانم
مەست مەست
بەدەم گوتنەوەی
لاوکی تەنیاییەوە
خەریکی پیاسە کردنە

## ١٤

پایز بە تارایەکی سوور و
منیش جگەرەیەک بە لێومەوە
لەنێو کۆڵانەکانی بەهەشت
مەست مەست
بەدەم پیاسەوە

گۆرانییەکانی غوربەتمان
دەگوتەوە

## ١٥

پەریەکی ڕەشپۆش
لەژێر کەپرە فێنکەکانی دۆزەخ
مەمکۆڵەکانی داوەتە بەربا و
بێهوودەییەکانی من
لە نێو کتێبێکی سپی
دەنووسێتەوە

**سەرەتای ئۆکتۆبەری ٢٠١٣**

## بەشی هەشتەم :

### ١

ژیانی من
جگە لە پارچە لبادێکی
سارد و سڕی
نێو ژوورێکی شێدار
هیچی تر نەبوو
ئەگەر
گەرمایی نێو
کتێبە تۆز لەسەر نیشتووەکان و
ڕۆشنایی
پەنجەرەکانی عەشق نەبا
من نەمدەتوانی بژیم

٢

تەنیایی من
لە تەنیایی
ژنە لەشفرۆشێک دەچێ
پڕاوپڕە لە ئاوەدانی
خەونی من
لە خەونی
منداڵێکی لاسار دەچێ
پڕاوپڕە لە پێکەنین

٣

من پێویستیم بە بارانە
تا لێوە وشکهەڵاتووەکەی ژیان تەڕبکەمەوە
پایزی نێو دڵی تۆش پڕ بکەم لە سەوزایی

٤

ئێمە هەموومان
خۆمان تەسلیم بەم درۆیە گەورە کردووە
کە دەڵێین
گەر عەشق لەژیان دەربکەین
ژیان هیچی لێنامێنێتەوە
ئێمە وەک چۆن تاکو ئێستا
نەمان توانیوە خەون ببینین
نەمان زانیوە عەشقیش بکەین
ژیانی ئێمە لە هیچەوە دەستی پێکردووەو
لەنێو ڕووبەری هیچەوە دەسووڕێتەوە و
بە هیچیش کۆتایی دێت
هیچ و هیچ و هیچ
هیچ تا ئەبەد هیچ

٥

هەموومان ڕقمان لە مردنە
بەڵام گەر مردن نەبا
ژیانیش نەدەبوو
وەک چۆن
گەر تۆ نەبای
عەشقیش نەدەبوو
یان / گەر من نەبام
بێهوودەییش لە دایک نەدەبوو

٦

ژیان چ پارادۆکسێکی توورەهاتە
کە ژنە شۆخێکی شەدەلار
نەتوانێ لەوە تێبگات
ئەو دەمەی

نەبوونی ئەو
پەیکەری بوونی من
ڕەنگ دەکات
یان / مردنی من تێکەڵ بە ژیانی ئەو دەبێ
ئەوە مانای وایە
عەشق بۆ خۆی لە نێو
تابووتێکی ڕەنگ خۆڵەمێشی
بە ئارامی ڕاکشاوە

٧

ڕازیم بەوەی
هەموو دیوانە شیعرییەکانم
لە کتێبکدا
بچووک بکرێتەوە
بچووک بچووک بچووک

تا ژنە شۆخێکی گەنم ڕەنگ
بیکاتە ملوانکەیەک و
بەنێو مەمکۆڵەکانیدا
شۆڕیکاتەوە ...!

٨

گوڵە گیان
نزیک بەرەوە لێم
نزیک نزیک نزیک
تا لێوەکانم
ڕەنگی لێوەکانت
چاوەکانم
ڕەنگی چاوەکانت
هەموو جەستەم

ڕەنگی تۆ دەگرن
تا هەناسەم
بۆنی قژی خاو و
بۆنی ڕۆحی تۆی لێ دێ
تا ئەو ئاستەی
نە مەمکەکانت
نە خۆت
نەتوانن
لێم جیا ببنەوە

٩

من خاک و ئاوم هەیە
بەڵام نیشتیمانم نییە
من مولک و ماڵم هەیە
بەڵام بەختەوەریم نییە

دڵبەرێکی شۆخ و شەنگیشم هەیە
بەڵام ئازادیم نییە

## ١٠

من شیعرەکانم
بە خوێنی خەیاڵەکانم و
بە خوێلی خەونەکانم و
بە خوێنی خۆم دەنووسمەوە
بۆیە لای من
بوونم گیان فیدایی عەشقە لە پێناو ژیان
ژیانم گیان فیدایی بوونە لە پێناو عەشق
عەشقم گیان فیدایی ژیانە لە پێناو بوون

## ١١

ئەی شەویارم
شیرین شیرین
شەباهەنگی شەوەکانم بدرەوشێنەوە

بە شەڕابە شینەکانی شادومانی
بمکە بە شاسوار و شازادەی عەشق

## ١٢

نائومێدی لەگەڵ بووممان
لەگەڵ سەوزایی درەخت
لەگەڵ ئومێدەکانی ئاو
لەگەڵ زەردەخەنەکانی هەور
لەگەڵ فرمێسکەکانی عەشق
لەگەل سەمفۆنیاکانی زەماوەند
لەگەڵ نووری خودا
هاتۆتە نێو ژیانمان
هەمووممان بەشێکین لە نائومێدی
هەر هەمووممان
لەنێو ماڵە گەرمەکەی نائومێدی
هەناسە دەدەین و گەورە دەبین

## ١٣

لەنێو بازنە داخراوەکانی تەنیاییم
من گەریدەیەکی نامۆ و ماندوو
نە لە پەنا هیچ بەرد و ئەشکەوتێک
نە لەژێر سێبەری هیچ دارێک
نە لە کەناری هیچ ڕووبارێک
ناگیرسێمەوە
هەر دەڕۆم و هەر دەڕۆم
کە شنەی با هەڵدەکات
من دوور دەکەومەوە
کە باڵا ئەسمەرییەکەی هەور دەردەکەوێت
من دوور دەکەومەوە
شەوانانیش کە ئەستێرانم لێ بەدەردەکەون
من دوورتر دەکەومەوە
بەڵام کە لە نێو تەمە سپییەکانەوە

ڕوخسارە نەرمە ئاوریشمییەکەی دایکم دەبینم و
بەرەو لام دێ
من لێی نزیک دەبمەوە
نزیک نزیک نزیک
لە بەردەمی چۆک دادەدەم و
خاکی ژێر پێیەکانی ماچ دەکەم

## ١٤

من منداڵیم پڕ بوو
لە ساڵەکانی پیریم
لاوێتیشم پڕ بوو
لە هەڵبەز و
سەرشێتیەکانی منداڵیم
بەهیوام داهاتووشم
پڕ بێت لە گەنجیم

## ١٥

ژیان چ توورەهات و بێ مانایە
کاتێک عەشق نەتوانێ
تەعبیر لە شتە جوانەکانْ بکات
کاتێک عەشق
جگە لە گەردەلوول و
خەونێکی فۆبیایی
هیچی تر نەبێ ...!؟

**نیسانی ٢٠١٤**

**بەشی نۆیەم :**

١

من کە مردم
تەنیاییم لەگەڵ خۆمدا
دەبەمە ژێر خاکەوە
بۆ ئەوەی کەس
وەکو من تەنیا نەبێت

٢

چاوەڕوان بووم
دوای نیوەڕۆیەک
ژنێکی شۆخ و گەنم ڕەنگ
بێتە لام و

بە زەردەخەنەیەکەوە پێم بڵێ
ئەی شاعیرە ڕۆژهەڵاتییە تەنیاکە
تەنیاییت باش ...!

٣

من ئارەزووم لە ژنێکە
کە هەموو
ڕۆژەکان و شەوەکانم
پڕکات
لە سۆز و لە ناز و عیشوەی ژنانە
هەموو
خەون و خەیاڵەکانم
پڕکات
لە گەمە و لە گفت و گۆرانی ژنانە

٤

عەشق وای لێکردووم
خەونەکانم خوێن و
خۆشم شیعرم
لێ بچۆڕێ

٥

لەو ڕۆژەوەی ئاوێنەی بەختم شکاوە
شەوەکانم پڕ بوون لە وردە ئەستێرەی تاریک و
خەیاڵەکانیشم پڕ بوون لە وردە خەونی نائومێدی

٦

سەردەمانێک
لەنێو ژیانی من
عەشق حیکایەتێکی سەوز بوو
لەنێو تابلۆکانی بەهار دەنووسرایەوە

٧

من لە یادەوەری باخچە
جێگایەکم نییە
لە نێو کتێبەکانی جەنگ
وێنەیان نەکێشاوم
لەنێو مەملەکەتی ئەستێرانیش
پەیکەریان بۆ دروست نەکردووم
بەڵام ،
لەنێو شەقامەکانی ئاگر
ژنە سۆزانییەکان
لەسەر دیوارەکانی خەیاڵیان
شیعرەکانم دەنووسنەوە

٨

من لەنێو خەونەکانم
وەرزەکانی مردنم بیرنایەتەوە

کە گۆرانیش بۆ عەشق دەڵێم
ڕەنگەکانی تاریکی ناناسمەوە
لەنێو باخچەی نیگەرانیش
لەژێر سێبەری دڵنیایی ڕادەکشێم

٩

دەرگای سبەینێم لێ بکەنەوە
من دەرگای دوێنێم
بە ڕووی خۆمدا داخستووە
وا خەریکە بەفر
جەستەی ژیانم دادەپۆشێ

١٠

من وام
بە جیا لە هەموو کەسێک

هەمیشە
لە ناوەوەی بێدەنگی بێدەنگ نەبووم و
لە دەرەوەی هاواریش هاوار دەکەم

١١

من لە قورولیتەی گەڕەکەکانی
نێو خەونەکانم و
لە شەقامە قیرتا و بەردینەکانی غەریبی
بێزار بووم
ماڵم دەبەمەوە نێو کتێبان
لەنێو باخچە رەنگینەکەی شیعر
بە وشە ناسک و ئیرۆسییەکان
کەپرێک بۆخۆم دروست دەکەم و
تاهەتا لەویدا دەمێنمەوە

١٢

تۆ هەمیشە
قسان بۆ بەرد دەکەیت
قسان بۆ با دەکەیت
قسان بۆ بەفر دەکەیت
قسان بۆ باران دەکەیت
قسان بۆ باڵندەکان دەکەیت
بەس بۆ من نا ....!

## ١٣

تۆ هەمیشە
ستایشی مانگ دەکەیت
ستایشی مردن دەکەیت
ستایشی مەمک دەکەیت

ستایشی مرۆڤەکان دەکەیت
ستایشی مێرووڵەکان دەکەیت
بۆ منیش بەس گلەیی

## ١٤

گوڵەکەم تۆ دەتوانی
ماڵەکەم لێ بسەنیەوە کتێبەکانم نا
خەونەکانم لێ بسەنیەوە خۆزگەکانم نا
ڕووناکیم لێ بسەنیەوە عەشقم نا
ژیانم لێ بسەنیەوە ئازادیم نا
چاوەکانم لێ بسەنیەوە شیعرەکانم نا
دەتوانی گوڵەکەم دەتوانی
کتێبەکانم و خۆزگەکانم و
عەشق و ئازادیشم لێ بسەنیەوە
بەس شیعرەکانم نا ...!

## ١٥

بەر لە ڕۆیشتنت
گلەیی ئەوەت لێدەکردم
کە من بە نهێنی شیعرم بۆت دەنووسی
بەڵام ئەی شۆخ
گەر ئەمجارە بگەڕێیتەوە
بەڵێن دەدەم
لەسەر ڕوومەتە خرپنەکانی مانگ
بە بەر چاوی هەموو ئەستێرەکانەوە
یان لەنێو مەمکۆڵەکانی ڕووبار
بە بەر چاوی هەموو شەپۆلەکانەوە
ئیرۆسیترین شیعری خۆمت بۆ بنووسم

**ناوەڕاستی ئایاری ٢٠١٤**

## بەشی دەیەم :

### ١

من زۆرجاران
لەنێو سێبەری تۆ
شیعرەکانم دەنووسمەوە
بۆیە هەرکاتێک تۆ دەڕۆی
وشەکانم لەسەر ڕووی گەڵاکان
بەجێدەمێنن
یان هەندێکجار
تێکەڵ بە خۆڵ و خاک دەبن
بۆیە هەمیشە
درەخت و خاک
بۆنی هەناسەکانی منیان لێ دێ

٢

من لە نێو ماڵەکەی تۆ ... لەوێم
لە نێو خەیاڵەکانی تۆ ... لەوێم
لە نێو خەونەکانی تۆ ... لەوێم
لە نێو یادەوەرییەکانی تۆ ... لەوێم
بەڵام لە نێو ژوورەکانی دڵت ... لەوێنیم

٣

تۆ لە نێو شیعرەکانم ... لەوێی
لە نێو خەیاڵەکانم ... لەوێی
لە نێو خەونەکانم ... لەوێی
لە نێو یادەوەرییەکانم ... لەوێی
لە نێو ژوورەکانی دڵم ...
وەک زیندانییەکی هەتاهەتایی هەر لەوێی

٤

من و تۆ
لە هەموو شتێک لەگەڵ یەکدا جیاوازین
بە جیاواز
ئایەتە ئەڤینییەکانی ئارەزوومان دەخوێنینەوە
بە جیاواز
لە ڕەنگەکان و خەونەکان و تارماییەکان دەڕوانین
بۆیە کاتێک /
من بەنێو گەڕەکەکانی هەوردا دەڕۆم
تۆ بەوێدا مەڕۆ
یان بەنێو کۆڵانەکانی ئەستێرەدا دەڕۆم
تۆ بەوێدا مەڕۆ
یان بەنێو شەقامەکانی سەوزاییدا دەڕۆم
تۆ بەوێدا مەڕۆ
یان بەنیو دارستانەکانی خۆرەتاودا دەڕۆم
تۆ بەوێدا مەڕۆ
بەڵام گوڵەگیانم ...
گەر بەنێو میترۆکانی عەشق دا ڕۆیشتم
گورج گورج وەرە و لەتەک مندا بڕۆ ...!

٥

من حەز دەکەم تۆ هەمیشە
کەیفساز و ئاسوودە بیت
پەرستگەکانی خەیاڵت ..... ڕووناک رووناک
چاوەکانت ................. ڕووناک ڕووناک
ژوورەکانی دڵت ............ ڕووناک ڕووناک
ڕێگاکانت ................... ڕووناک رووناک
حەوشەی پشتەوەی ماڵیشتان . تاریک تاریک

٦

لێگەڕێ با بدرەوشێتەوە
تریفەی مانگی شەوەکانی من
لە نێو دەفتەری بیرەوەرییەکانی تۆ
وەک چۆن هەمیشە دەدرەشێتەوە
مانگی تریفەی خەونەکانی تۆ
لەنێو قەسیدە و
ئایەتەکانی عەشقی من

٧

وەک چۆن
شەوە ئەنگوستەچاوەکانی تۆ
هەمیشە دووگیانن
بە خەونە سپییەکانی من
ئاواش
بەیانییە بریندارەکانی منیش
مەست و حەیرانن
بە سپێتی خەونەکانی تۆ

٨

وەک چۆن
هاژەی تاڤگەکانی عەشقی من
هەمیشە
ئومێدە خونچەییەکانی تۆی
هێناوەتە سەما
ئاواش
تاڤگە هاژەییەکانی عەشقی تۆش
لەم بیابانی غوربەتەم
ژیانی بە من بەخشیوە ، ئەی گوڵم

## ٩

چەندە جوانن
برژانگی سەر چاوەکانت
تۆقەی سەر قژی خاوت
خاڵەکەی سەر گەردنت
سوخمەی سەرکراسەکەت
ستیانی سەر مەمکەکانت
هەموو شەوێک
شەڕ لەگەڵ مانگی خەیاڵم دەکەن
چاوەکانی ژێر برژانگەکانت
قژی خاوی ژێر تۆقەکەت
گەردنی ژێر خاڵەکەت
کراسی ژێر سوخمەکەت
مەمکەکانی ژێر ستیانەکەت

١٠

لەکاتی ئاودانی گوڵەکانم
یان لەنێو قووڵایی نیگاکانم
من هەمیشە
بیر لە تۆ دەکەمەوە

١١

من هیچم نەماوە لەنێو ژیان
جگە / لەتێک نان و
مەرکانێک عەشق نەبێت

١٢

لە دووری تۆ
مەوداکانی نێوان من و هەتاو
بە وردە شووشە و
شەوەکانی نیوان من و شیعر
بە وردە ئەستیرە و
بازنەکانی نیوان من و خەون
بە وردە چرۆکانی نائومێدی / داپۆشراون

## ١٣

دوور لە تۆ نا
دوور لە خۆم
بە تاقی تەنێ
لە ژوورێکی تاریک
ڕۆژەکان و وەرزەکان و ساڵەکانم
بەڕێدەکەم

## ١٤

من لە جنسی بروسکە بووم
کەچی نابینا و بێکەس و تەنیا مامەوە
عەشق چ گەمەیەکی تووڕەهاتە / ئەی قەدەر

## ١٥

تا سەر ئێسقان نامۆم بە خۆم
تا سەر ئێسقان نامۆم بە ژیان
تا دێ / لە خۆم و
لە عەشق و ژیان
دوورتر دەکەومەوە
مردن لە کوێیە / ئەی خودا ...؟

**جۆزەردانی ٢٠١٤**

## بەشی یانزە:

### ١

کە مانگ لە ئاو
تەم لە کانی
هەور لە چیا
ئەستێرەکان لە درەخت
باران لە گیا
یان /
کە تۆ لە من دوورکەوتییەوە
دنیا پڕ بوو لە گوناه و
منیش تابلۆیەکم لە تەنیایی و
تاڤگەیەکم لە بێهوودەیی

٢

نامۆبوونی من
لەو ساتەوە دەستپێدەکات
کە دەبینم
عاشقەکان هەمان گۆرانی دەڵێنەوە و
شەپۆلەکانیش هەمان سروود
باران بە هەمان لەنجەوە دەبارێ و
مرۆڤەکانیش هەمان خەون دەبینن ...!

٣

کە هاتمەوە
تەنیایی خۆم
بۆ ماڵی خودا دەنێرمەوە
ڕەنگ زەردییەکەشم لە غوربەت جێدەهێڵم

دێمەوە
تا ئەبەد
لەنێو ڕۆحە پاکیزەییەکەی تۆ و
لە نێو دڵە سەوزەکەی پایز دەمێنمەوە

٤

ئەوەی تەنیایی کرد
بە بەشێک لە بوونی من
ئەوە تۆ بووی
نەک /
کیشوەرە دوورەکانی غوربەت

٥

دیوێکی ناوەوەی من ڕەش ڕەشە
دیوەکەی ترم سپی
چاوێکم تەنها لە تاریکی دەبینێ
چاوەکەی ترم لە ڕووناکی
بۆیە من نامۆم بەخۆم
هەمیشە ،
بەدوای حەقیقەتی خۆمدا دەگەڕێم

٦

بە قژە زەردەکەی خۆرەتاو و
بە خۆرەتاوێکی قژ زەرد سوێند دەخۆم
بە چاوە سەوزەکەی بەهار و
بە بەهارێکی چاو سەوز سوێند دەخۆم

کە من هەمیشە خەون بە تۆوە دەبینم
ئەی / خانمە چاو بە خومارە خەملیوەکەی خەون

٧

پەیوەندی نێوان
بەرد و ژیان
وەک پەیوەندی
نێوان
مرۆڤ و ئازادی وایە

٨

زۆر لەمێژە
ماڵم لەسەر پشتی ئەسپی بایە
لەنیو بەهەشت و دۆزەخی نێو کتێبان
ئەمبەر و ئەوبەر دەکەم

٩

کە لە نێو ماڵی عەشقی من
دەرگای سۆز و لاواندنەوە
بە ڕووی مندا داخرا بێت
ئیدی /
زەردەخەنەی سەر ڕوخساری
وەرزەکانی موحیبەتم
لە کوێ ببینم / ئەی خودا ...؟

١٠

نە لە نێو نیشتیمانی غوربەتم
نە لە نێو نیشتیمانی دایکم
نە لە نێو نیشتیمانی شیعرم
لە هەر جێگایەک
کە تۆی لێ نەبێت

منیش لەوێ نیم
نە ڕەنگم نە دەنگم نە بیرەوەریم
تەنانەت بوونیشم
وجودی نییە لەوێدا ...!

## ١١

هه‌موو حیکایه‌ته‌کانی عه‌شقی من
جگه له هه‌ڵهاتنی
چه‌ند ورده ئه‌ستێره‌یه‌کی ڕه‌ش
له نێو ئاسمانی یاده‌وه‌ریم
هیچ شتێکی تر نه‌بوو

## ١٢

هێنده لێمدووری
هه‌موو ڕۆژێک
تووڕه‌بوونی زه‌رده‌خه‌نه‌که‌ت
به ڕووه خه‌مناکه‌که‌ی خۆره‌تاو ده‌خوێنمه‌وه
ئه‌م چیرۆکی عه‌شقه ئاگراوییه چی بوو
له نێو کتێبی مردنی منت نووسییه‌وه / ئه‌ی شۆخ ...؟

## ١٣

سه‌رده‌مانێک
له‌نێو وه‌رزه پاییزییه‌کانی شیعرم
عه‌شق گۆرانی بۆ ژیان ده‌گوت
ئیستاش مردن
یاده‌وریيه غه‌مگینه‌کانی عه‌شق
بۆ ژیان ده‌گێڕیته‌وه

١٤

لە نێو ( کۆڵانەکانی ڕۆژهەڵات )
بە نامۆبوونی خۆم ئاشنا بووم

لە نێو کۆڵانەکانی خەونیش
بە یاخیبوون

١٥

کە دەستم بە شیعر نووسین کرد
باوەڕم وابوو
کە مردن ناتوانێت من بدۆزێتەوە
ئێستاش لەسەر هەمان بیرکردنەوەی خۆمم
من پێموایە
شیعر لە مردن بەهێزترە نەک ژیان

**ئۆکتۆبەری ٢٠١٤**

## بەشی دوازدەهەم :

### ١

من بە چاوەکانی خۆم نا
بە نیگاکانی ژنێکی تەنیا لە گوڵ و جوانییەکانی سروشت دەڕوانم
من بە بیرکردنەوەکانی خۆم نا
بە خەیاڵی ژنێکی تەنیا لە ژیان و
ئایندەم
ورد دەبمەوە
من بە مەراقەکانی خۆم نا
بە تێنویتی ژنێکی تەنیا
حیکایەتەکانی عەشق و
ئایەتە ئیرۆسییەکان دەخوێنمەوە

٢

ڕۆیشتنی تۆ
تەنها بەندکردنی من نەبوو
لەنێو زیندانی تەنیاییمدا
ڕۆیشتنی تۆ
کوشتنی عەشقێکی ئەبەدی بوو
لە نێو مندا

٣

لەنێو تەنیایی خۆمدا
هێندە سەرمەست و سەرقاڵم
وەکو کتێب / پڕم لە ژیان
وەکو شیعر / پڕم لە عەشق
وەکو بروسکەش پڕم لە یاخیبوون

٤

ئەی ژن
دواهەمین سنوورەکانی عەشقمان بڕی
ئیتر / من لە نێو ژیانی خۆم دەرتاندەهێنم
ئێوەش لە نێو مردنەکانتان

٥

نازانم
دنیا بچووک بۆتەوە
یان دڵی من
شەوەکان تاریکتر بوون
یان ڕۆحی من
ئەوە داگیرساندنی
چەندەمین مۆمی مردنە
لەم وەرزی فەنابوونی عەشق و

لەم هەڵوەرینەی گەڵاکانی ئومێد و
لەم کەرنەڤاڵی دابڕان و شێتبوونەدا ...!؟

٦

( کاتژمێر چەندی مردنە )
لەم سەفەری جێهێشتنی نیشتیمان و
لەم ئاگربارانەی بە خەڵووزبوونی عەشق و
لەم حیکایەتی ڕەشداگەڕانی نیگاکان و
لەم خەڵوەتگەی بە خۆڵەمێشبوونی خەونەکان و
لەم غوربەتگەی مەرگ و خۆکوشتنەدا ...!

٧

من و تۆ
خۆمان بە پیتە زەیتوونییەکانی
فەنابوون هەڵواسیوە

لەنێو تابلۆ ئەبستراکەکانی عەشق
ڕەنگی یەکتریمان گرتووە

٨

تۆ دەتوانی
بەیانییەک بێیت و لە خەو هەڵمسێنی
بە زەردەخەنە گەرمەکەتەوە پێمبڵێی
ئەی شاعیرە ڕۆژهەڵاتییەکە بەیانیت باش
یان دوای نیوەڕۆیەکی کەنار دەریام
لە کاتی ونبوون و نغرۆبوونم
لە نێو تەمە سپییەکانی خەیاڵ
بێیت و لە پشتڕا
بە دەستە نەرمەکانتەوە چاوەکانم بگریت
هەر بەهەمان زەردەخەنەی گەرمەوە پێمبڵێی
ئەی شاعیرە ئیرۆسییەکە تەنیاییت باش

هەر لەوێدا لە تەکما دابنیشیت
حیکایەتی خەمناکترین عەشق و ٦
عەشقی خەمناکترین حیکایەتم
بۆ بگێڕیتەوە
ئای چەند تامەزرۆی ئەم چرکەساتانەم ئەی گوڵەباغ !

٩

من لە نێو خەونەکانم
تۆم دۆزییەوە
لە نێو شیعرەکانیشم
تۆم ونکرد
تۆ هەبیت یان نا
شیعر و خەونەکانم
تا دێ
زێتر لە یەکتری نزیک دەبنەوە

١٠

ڕەشێتی چاوەکان و
ڕەشێتی جلەکانت
هەمیشە و هەمیشە
دڵی من و ژووری تەنیاییم
ڕووناک دەکەنەوە
ئەی گوڵە ڕەشپۆشەکەی
نێو باخچەکانی خەون و خەیاڵم

## ١١

من و تۆ
دوو پەپوولەین
لە هەڵمی قاوەیەکی تاڵ دەچین
لە دووری یەک

نائومێدانە
لە بۆشایی دەسووڕێینەوە
لە سەر هیچ گوڵێک
هیچ کانییەک هیچ باخچەیەک
ناگیرسێینەوە

## ١٢

ماوەیەکە من خەوم نەماوە
بۆیە خەون بە هیچ شتێکەوە نابینم
من دەمەوێت خەوم ئاسایی بێتەوە
تا خەون بە تۆوە ببینم
ئاخر گەر خەون نەبێت
من چۆن خۆم لە باوەشی تۆ ببینمەوە و
دەستم لە مەمکە ئاگراوییەکانت گیر ببێ

١٣

تەمەنێکت لەنیو شیعرەکانم
بەسەربردووە
شیعرەکانم بوونەتە ماڵ و نیشتیمانت
تۆ بەو هاتنەت
ڕووناکیت بە ڕۆح و
ئازادیت بە خەیاڵ و
ئەبەدییەتت بە من بەخشی / ئەی خوداوەند ...!

١٤

قەدەر ئێمەی لەسەر گەڵا وەریوەکان
نووسیوەتەوە
بۆیە دەوارە زەردەکانی پایز و
کێڵگە خۆڵەمێشییەکانی با
ماڵی ئەبەدی ئێمەیە / ئەی گوڵەباغ ...!

## ١٥

بە دوای تۆدا
بە نێو بادا گەڕام
بە نێو باراندا گەرام
بە نێو سەوزاییدا گەرام
بە نێو خۆرەتاودا گەرام
بە نێو تاریکی و ڕەشەبا و مردنیش دا گەرام
بە نێو هەور و ئەستێرە و تەمە سپییەکانیش دا گەڕام
تا دواجار / لە نێو شیعر و خەونەکانم تۆم دۆزییەوە

**دیسەمبەری ٢٠١٤**

بەشی سیانزە :

١

درەخت باسی جوانی و
ئاو باسی ئازادی و
باران باسی عەشق و
ئاگر باسی ئایندە و
پایز باسی ژیان و
تۆش هەمیشە باسی ..
تەنیایی خۆتم بۆ بکە / ئەی گوڵەباغ

٢

ئەی میهرەبان
تۆ پەیکەرێکی لە ئاو
منیش درەختێکی بیابانیم
وشک و تینووم
هەر کاتێک لێم نزیک دەبییەوە
نەک هەر لەزەت و ئارامی
ئاسوودەیی و دڵنیایی
بەڵکو ژیانم پێدەبەخشییەوە

٣

تۆ دەتوانی
هەموو شەوەکان و
ڕۆژەکانی تەمەنم بۆ خۆت ببەی
هەموو قەسیدە ئیرۆتیکەکانم

تەنانەت وشە ڕووتەکانیشم
منیش تەنها
سی و سێ خولەکم لە تۆ دەوێ
پانزە خولەک بۆ پیاسە
پانزەکەیتر بۆ سەما
سێ خولەکیش بۆ وردبوونەوە لە نیگا و
لە ڕوخسار و لە باڵا ڤینۆسییەکەت

٤

وەک چۆن ئاسمان بە فرمێسکەکانی
ژیان دەنووسێتەوە
تا درەخت و خاک
گوڵ و باخچە سەوزتر بن
منیش بە فرمێسکەکانم تۆم نووسییەوە
تا زەردەخەنە و نیگاکانت گەرمتر بن

٥

کە تۆ هاتی
ژوورە تاریکەکانی تەنیاییت
ڕووناک کردمەوە
خەڵوەتگە ساردوسڕەکانی
نێو خەونەکانیشم

٦

لە نێو مانگەکانت / دیسەمبەر
لە نێو وەرزەکانت / پایز
لە نێو نیگا گەرمەکانیشت / هەر هەموویان
تۆیان لە من نزیکتر کردۆتەوە

٧

من لە نێو شیعرەکانم دا
لەسەر دیواری خۆرەتاو
تابلۆیەک بۆ ژیان دەنەخشێنم
لەسەر سینگی ئەستێرە سوورەکانیش
تابلۆیەک بۆ ئازادی
لەسەر پەراسووەکانی زەویش
تابلۆکانی عەشق و ئاویزانبوون

٨

من ئەمشەو سێوەکانم دابەشدەکەم
بەسەر ئەو ژنانەی خۆشم دەوێن
سێوی یەکەم بۆ تۆ
سێوی دووەم بۆ تۆ
سێوی سێیەمیش بۆ تۆ

هەموو سێوەکانم بۆ تۆ
هەر تۆ و هەر تۆ و هەر تۆ
دیسانەوە ، تۆ تا ئەبەد تۆ

## ٩

دوێنێ شەو
لە باوەشی گەرمی تۆ خەوم لێکەوت
لە خەونم دا ..
منیان برد بۆ بەهەشت
بینیم تۆ لەوێی
بەرلەوە منیان برد بوو بۆ دۆزەخ
تۆ لەوێندەرێش بووی
دواتر گەڕامەوە مەملەکەتی غوربەت

تۆ هەر لەوێ بووی
لەسەر ڕێگای گەڕانەوەم سەرێکم لە نیشتیمان دا
تۆ لەوێندەرێش بووی
تۆ لە هەموو شوێنێکی نێو گەردوونی دڵی منیت .. ئەی میهرەبان

١٠

منداڵێک لە مندایە
پڕاوپڕە لە قسەی نەگوتراو
ژنێک لە مندایە
پڕاوپڕە لە خەیاڵی عاشقانە
پیاوێک لە مندایە
پڕاوپڕە لە وردە ئەستێرەی سپی
خودایەک لە مندایە
پڕاوپڕە لە ڕەشەبا و زریان

درەختێک لە مندایە
بەردەوام گەڵای لێدەوەرێ
منیش بە هەموو بوون و خەونەکانمەوە
وام لە نێو شیعرەکانم دام

## ١١

من ئەو پەنجانەی تۆم خۆشدەوێن
کە ئەم وشە سپییانەم بۆ دەنووسن
من ئەو خەیاڵەی تۆم خۆشدەوێت
کە تابلۆیەکی ڕەنگینم بۆ ڕەسم دەکات
من نیگاکانی تۆم خۆشدەوێن
کە نهێنییەکانی جوانیم بۆ دەدرکێنن
من هەموو شتێکی تۆم خۆشدەوێ
کە تەنیاییم پڕ دەکەن لە ئارامی

## ١٢

دنیا پڕە لە بازنەی ڕەنگاورەنگ
من لە بازنەیەکدا دەخولێمەوە
تۆ لە یەکێکی تر
من بە پەیژەیەک بەرەو ئاسمان سەردەکەوم
تۆ بە یەکێکی تر
دەڵێن ژیان بە جیاوازییەکانەوە جوانە
بەڵام من هەمیشە ئازار بەوە دەبینم
کە دەستەکانم ناگەن بە مەمکەکانی تۆ ...!

## ١٣

من هێندە لێت نزیکبوومەوە
تا ئاستی عەشق
هێندە لێت نزیکبوومەوە

تا ئاستی خۆم
هێندە لێت نزیکبوومەوە
تا ئاستی خۆت
کەچی تۆ
هەر بێدەنگ و هەر بێدەنگ و هە ربێدەنگ
تا ئاستی ونبوون و ڕەشبوونەوە

## ١٤

سێوەکانی خۆتم بۆ بنێرە
تا ماڵەکەم پڕ بێت لە بۆنی سێو و
خەونەکانیشم لە بۆنی تۆ

١٥

پەلکەزێڕینەی نێو ئاسمانی خەیاڵم
ڕەنگی تۆیان گرتووە
ڕەشەڕەیحانەی نێو باخچەی خەونەکانم
بۆنی تۆیان گرتووە
وردە ئەستێرەی نێو نیشتیمانی شیعرەکانم
بە ڕووناکی نیگاکانت دەدرەوشێنەوە
منیش لەم نێوەدا پڕم لە عەشقی تۆ ...!

**کۆتایی دیسەمبەری ٢٠١٤**

**بەشی چواردەهەم :**

١

تۆ بیر لە هەموو شتێک دەکەیتەوە
تەنها خۆت نەبێ
گرینگی بە هەموو شتێک دەدەی
تەنها عەشق نەبێ
کەچی ساڵەهایە من لە نێو دۆزەخی
عەشقی تۆدا دەسووتێم

٢

من خەیاڵەکانم ڕەنگی مەمکیان گرتووە
خەونەکانیشم پڕ بوون لە مەمک
چی دەبوو ئەگەر فریشتەکان

لە دوو مەمک زێتریان هەبا
یان / پەیکەرێک بان لە مەمک
ژیانیش ڕەشماڵێک با
لە بنار مەمکۆڵەیەک هەڵدرابا

## ٣

ئەگەر تۆ عاشقی من بای
لە فیردەوسی بەرین
کۆشکێکم بۆت دروست دەکرد
بە خۆرەتاو دەمڕازاندەوە
بە شەونم گوڵەکانم ئاودەدا
بە ڕەنگەکانی پەلکەزێڕینە
دەرگاو پەنجەرەکانم بۆیە دەکرد
هەموو ئەستێرەکانی دنیام
لە دەورەی ماڵەکەت ڕیز دەکرد

هەموو حۆرییەکانی خودام بانگ دەکرد
هەندێکیانم دەکرد بە موزیکژەن
هەندێکیان بە سەماکار
هەندێکیشیان هەر بۆ دڵخۆشی تۆ با لەویابان
ئاخ بەس ئەگەر تۆ عاشقی من بای ...!

٤

دەڕۆم ئاوڕ لە هیچ شتێک نادەمەوە
نە لە تۆ نە لە خودا نە لە فریشتەکان
ژیان جگە لە سەفەرێکی تووڕەهات
هیچی تر نییە ...!

٥

خۆم نا سێبەرم ڕەنگی تۆی گرتووە
لە نێو دڵم نا لە نێو یادەوەرییەکانم ماویی

وەک کات خێرا تێپەڕیت و بووی بە ڕابردوو

٦

ئێمە وا ڕاهاتووین
لە ڕوانگەی نائومێدییەکانەوە
وەڵام بە خەونەکان و بە عەشق و
بە خۆزگەکانمان و
لە ڕوانگەی مردنیشەوە
وەڵام بە ژیان بدەینەوە

٧

من و مانگ و خودا
مانایەک بە تەنیایی دەبەخشین
من و شیعر و عەشق
مانایەک بە بوون دەبەخشین

من و تۆ و نیشتیمانیش
مانایەک بە ژیان

٨

بۆ گەیشتن بە ئەستێرە گەشاوەکانی
نێو ڕۆحی تۆ
( پێی خەونەکانم فێرە ڕۆیشتن ) و
باڵی خەیاڵەکانم فێرە فڕین و
چاوی ئومێدەکانم فێرە بینین و
زمانی دڵم فێرە قسەکردن و
جەستەشم فێرە هێمنی و ئارامی دەکەم ...!

٩

من بەدوای ڕۆحێکدا دەگەڕێم
تەنیا وەک خۆم

شەیدا وەک خۆم
خەمۆکی و خوناوی وەک خۆم
ئەشقیا و ئیرۆسی وەک خۆم
نەشمیل و نەوڕەسی وەک خۆم
بێئۆقرە و بێپەروا وەک خۆم
یاخی و یاقووتی وەک خۆم
ڕۆحێکی ڕووت ڕووت
ڕووت ڕووت وەک خۆم ...!

١٠

( شەوێک لەو شەوە ساردانەی بە ڕووتی
لە ئامێزی نائومێدیدا خەوتم ...! )
دوێنێ شەو نائومێدی پێێ گوتم
وەک چۆن هەموو تەمەنت لە گەڵتابووم
بۆ ئەوپەڕی کیشوەرەکانی دنیا ڕۆیشتی

هێدی هێدی بە دواتدا هاتم
دڵنیابە بۆ مردنیش لە گەڵتا دێم ...!

## ١١

تۆ کە ڕۆیشتی
من لە نێو خەیاڵی خۆم
ڕووبارێک ئاوم بەدواتدا ڕشت

## ١٢

گەردەلوولی غوربەت
لە نێو دۆزەخی بێهوودەیی لوولی داوم
لوول لوول لوول
تەرزەکانی تەنیاییش وەکو تەون ڕۆحیان تەنیوم
تا ئاستی ڕەشبوونەوە

## ١٣

ئاسکۆڵە ڕەنگ پایزییەکەی خەیاڵم
تۆ تەنها پەرداخێک لە شەڕابی عەشقی خۆتم پێ ببەخشە
تاکو منیش / شیلەی هەموو گوڵەکان و
تریفەی هەموو شەوەکانی خۆمت پێ ببەخشم
تۆ تەنها لەسەر پارچە کاغەزێک چەند وشەیەکم بۆ بنووسە
تاکو منیش / لێوی هەموو ئەستێرەکان و گەردنی مانگ و
گەڵا گەڵا و پەڕ پەڕی ئومێدەکانت بۆ پڕکەمەوە لە شیعر

١٤

نائومێدی جوانی بە ژیان دەبەخشی و
هەناسەش بە عەشق

١٥

دەمێکە و زۆر لەمێژە
من بە زمانی گەڵا وەریوەکان

قسەت بۆ دەکەم و
تۆش بە زمانی ڕەهێڵە و زریان
من لە باوەشی ڕەشەبایەکی مردوو ڕاکشاوم
تۆش لە تەنیشت تاشە بەردێکی یاخی
چەند ئەستەمە /
ئەو دەمانەی هیچ شتێکمان پێنامێنێ بۆ گوتن
سەرەتا و کۆتایی حیکایەتەکان بەیەکدەگەنەوە و
پەنجەرەیەکیش شک نابردرێ بۆ ڕوانین
بوون و عەشق دەبن بە سفر
بەهاکان بەتاڵدەبنەوە و
ژیانیش دەبێتە بازنەیەکی توورەهات و هیچیتر ...!

**کۆتایی فێبرووەری ٢٠١٥**

**بەشی پانزەهەم :**

١

لەگەڵ شیعر بمنێژن
گۆڕەکەم پڕکەن لە نووری شیعر
من لەگەڵ شیعردا ئارامم

٢

بمسپێرن بە فیردەوسی شیعر
لەوێدا لە پەرستگەکانی موحیبەت
لەگەڵ خوداوەندی شیعر زیکر دەکەم

٣

من بە بێ شیعر
تابلۆیەکم بە بێ ڕەنگ
ئەستێرەیەکم بە بێ ڕووناکی
ڕووبارێکم بە بێ جووڵە
شیعر بەردەوام
ڕەنگ و ڕووناکی و جووڵەم پێدەبەخشێ

٤

جەنگ پیربووە لە نێو ژیانی ئێمەدا
هەروەها بێهوودەیی و مردنیش ...
ئێستاش وەک هەمیشە ژیان ئاوسە
بە هیوام / ئازادی یان عەشق یەکێکیان بێنە دنیا

٥

هۆ پەپوولە پاییزییەکە
گەر تۆ لە نێو باخچەی دڵم بمێنیتەوە
منیش خەونەکانت پڕ دەکەم لە ڕەنگە جوانەکانی عەشق
خەونەکانی ژیانیش پڕ لە ئازادی
مەمکەکانت بە لێو دەمژم
مەمکەکانی ژیانیش بە شیعر
دەوەرە دەی /
لە چاوەڕوانیت بووم بە پەیکەرێک لە هەور

٦

یەکەمین شەوی ژیان ئەو شەوە بوو
کە باران دەمی خستە نێو دەمی گیا و
ئەستێرەکانیش خۆیان بۆ تەمە سپییەکان ڕووتکردەوە
یەکەمین لە دایکبوونی منیش ئەو بەیانییە بوو

کە باڵندەیەک لە بەردەم پەنجەرەی ژوورەکەم
سروودی یاخیبوونی بۆمگوت و ڕۆیشتەوە

٧

گوڵە سوورەکەم
نازانم / ئەوە خونچە سوورەکانی لێوەکانتە
یان سووری ملوانکەی نێو مەمکۆڵەکانتە
خەونە هەنارییەکانمی سوور سوور کردووە

٨

من لە وەرزەکانی تەنیاییم
سەفەر بۆ ناوەوەی خۆمدا دەکەم
لەوێدا / لە کەنار دەریای غەریزەکانم
لە چاوەڕوانی تۆدا دەبم

٩

کات ژیان ڕووناک دەکاتەوە
دڵی منیش تاریک
هەناسە بە زیندەوەر و درەختەکان دەبەخشێ
بێهوودەییش بە من
چ دنیایەکی نائارام و تورەهاتە
من و کات هیچ دەمانێک
بەیەکەوە وەک دوو هێلی تەریب نەڕۆیشتووین

١٠

کتێبی بارانم خوێندەوە
هەموو لاپەرەکانی بڕ بوون  لە باخچە و گوڵ و سەوزایی
کتێبی نیشتیمانم خوێندەوە
هەموو لاپەڕەکانی پڕ بوون لە خوێن و خەون و نائومێدی

کتێبی عەشقم خوێندەوە
هەموو لاپەڕەکانی پڕبوون لە حیکایەت و
لە میهر و جوانییەکانی تۆ

١١

بەم ڕێگە تاریکەدا مەڕۆ ئازیز
کە وێنەی جەلادەکان بەسەرِ دیوارەکاندا ماوە و
هێشتا بۆنی مەرگییان لێدێ
مەڕۆ بۆ ئەو مەیخانەیەش
کە لە هەر گۆشە و قوژبنێکی
بوخچەیەک لە غەریزە ژەهراوییە ڕەشەکانی
بەرپرسە چاوچنۆکەکان لەسەر مێزەکان دانراوە
هەر لەژێر ئەو بارانە بمێنەرەوە
کە باڵندە و درەختەکان بەسەما دەهێنێ
جۆگەلە و ڕووبارەکان مەست دەکات و
خەون و خەیاڵەکانی ئێمەش پڕ دەکات لە خۆشەویستی

١٢

گوڵەگیانم
گەر جارێکی تریش لە دایکببمەوە
هەر بەدوای تۆدا دەگەڕێم
من بە عەشقی تۆ دڵگەش و شادومانم

١٣

پایزێک لە مندایە
زەرد وەک قژە زێڕینییە ئاوریشمییەکەت
بەهارێک لە مندایە
سەوز وەک چاوە پرشنگییە خومارییەکەت
بەفرانبارێک لە مندایە
سپی وەک مەمکۆڵە ئاگراوییە ئیرۆسییەکەت
خۆرئاوابوونێک لە مندایە

سوور وەک لێوە ناسکۆڵە خونچەییەکەت
تۆش بەم هەموو
ڕەنگ و ڕازە ڕەنگینییە ڕەونەقاوییەتەوە
وای لە نێو ڕۆح و
لە نێو خەون و شیعرەکانم دای / ئەی ڕەیحانە

١٤

شیعرەکانم
پڕن لەو مرۆڤانەی
قژیان ڕەشە
چاوەکانییان ڕەشە
پەنچەکانییان ڕەشە
گەردن و مەمکۆڵەکان و هەموو جەستەیان ڕەشە
بەڵام نیگا و زەردەخەکان و
خەون و خەیاڵ و دڵیان سپی سپیی ...!

١٥

سروشتی من وایە
خەون بە شتی جوداوە دەبینم
ژیانی جودا و ئایندەی جودا
ڕێگاوبان و ئاسمان و ئەستێرەی جودا
ڕووبار و تاڤگە و باخچەی جودا
جودا جودا جودا
هەموو شتێکی جودا بەس تۆ نا
تۆ وەکو خۆت
نەرم و نیان و نەوڕەسی وەک خۆت
نیگا گەرم و بزە گەرم و دڵگەرم وەک خۆت
تۆ وەکو خۆت
شۆخ و شەنگ و شەوئمیتر لە پەرییەکانی دەریا
جوان و نەشمیل و شەنگەبییتر لە فریشتەکانی خودا ...!

**نیسانی ٢٠١٥**

# (دەقی تەمەن وەک شوناس و نیشتیمانی شاعیر)

**-مانیفێستی ( دەقی تەمەن )**

من ئێستا لەگەڕەکی نائومێدیدا دەژیم
بە کەلوپەلەکانی عەشق ماڵێکم پێکهێناوە
لە ژوورێکدا تابلۆی دۆڕانەکانی خۆمم هەڵواسیوە
لە ژوورێکی تر / تابلۆی ترس و نیگەرانیەکانم
لە ژوورێکی تر / تابلۆکانی مردنم
لە ژوورێکی تر / تابلۆکانی تەنیاییم
لە دوواهەمین ژووریش وا خەریکم
هێدی هێدی
تابلۆکانی خۆکوشتنم هەڵدەواسم

١

دەقــی تەمــەن .. دەقێکــی کراوەیــە ، کــراوە بــە مانــای تــەواو نەبــووە و تەواویــش نابێــت . دەقێکــە لەگــەڵ تەمەنی شــاعیر دایــە واتە ، تا شــاعیر لــە ژیاندا بێت ئــەم دەقەش بەردەوامی دەبێت . شــاعیر لــەم دەقەدا ، منی خــۆی دەنووســێتەوە ، منی خۆی لەســەرووی هەمــوو منەکانــی دەوروبەر دەبینێــت . پەیوەنــدی ئــەو منە بــە نــاوە و دەرەوەی خۆی ڕەســم دەکات . منــی شــاعیر ڕۆحێکــە تژییــە لــە نەرجســیەت ، نەرجســیەتێکی ڕەهــا کە لە پشتی هەر بەهایەکی مرۆیی ئەم ڕۆحە نەرجسیەتە ئامادەیی هەیە ئامانجی شاعیریش لە نەخشاندنی ئەم ڕۆحە نەرجسیە ئەوەیە/ کە بوونی خۆی وەک مرۆڤ وەک پیرۆزتریــن بەهــــــا کــە شایســتە بــــــــە هەمــوو بەختەوەریــەک و جــــــــوانییەکە پێشــان بــدات. شــاعیر لــەم دەقەدا دەیهەوێ بە ڕۆحێکی دیکارت یانە بڵێ ( من شــیعر دەنووسم کەواتە مــن هەم ..! ) شــاعیر لە ڕێگەی شــیعرەوە مەبەســتیەتی بوونــی خۆی وەک بوونێکــی پیرۆز ســەیر بکات ، دەیهــەوێ بڵێ ئازادی و هەمــوو چەمکەکانی تر ، تووڕەهاترین شــتگەلێکن گەر مرۆڤ مومارەســەیان نەکات .. شــاعیر لە پانتایــی ئەم دەقە بە هیــچ ئاراســتەیەکی دیاریکراو ڕێناکات لــە هەمانکات ، وەک ڕۆحێکــی ســەرکەش و یاخــی ، دەکرێ هەر ئاراســتەیەک بگرێتە بەر . هەروەها شــاعیر خۆی نابەستێتەوە بە چرکە ســاتێکی دیاریکراوی زەمەن واتە ، زەمــەن پێکهاتەیەکی ناکاریگەرە لە نێو ڕووبەری دەقدا . شــاعیر هەموو ئەو گۆشــە و ڕووداو مەراقانە دەنووســێتەوە کە کاریگەری ڕاســتەوخۆیان لەسەر بــاری دەروونی و لە ســەر خەون و خەیــاڵ و پێکهاتە ڕۆحــی و غەریزەیی و

پێکهاتــە بایۆلۆژییەکانی بوونی ئەودا هەیە . هەموو ئەو گۆشــە و ڕووداوانەی ڕووبــەری بیرەوەریەکانــی ئەویان ڕەنگڕێژکردووە . ڕاســتە شــاعیر لە دەقی تەمــەن خــۆی دەنووســێتەوە بــەڵام ، ئــەم دەقــە جێــگای ئۆتۆبایۆگرافیش ناگرێتــەوە واتــە شــاعیر نایــەوێ ســەرتاپای ژیاننامــەی خۆی بنووســێتەوە.

## ٢

شــاعیر لە دەقی تەمەن ، ســێکوچکەیەک دەنەخشــێنێ لەنێوان ( من ، شیعر ، ژیــان ) لەڕێگــەی زمانی شــیعرەوە حیــوار لەگەل خۆی و ژیــان دا دەکات ، یــان دەیەوێــت لە ڕێگەی شــیعرەوە خــۆی و دەور و بەر یــان خۆیی و ژیان بناســێ ، یــان تابلۆی بوونــی خۆی لەنێو ژیاندا ڕەســم بکات .. یــان قودرەت و تواناکانــی زمانــی شــیعر کەشــف دەکات ، لەنێــو ڕووبــەرە پەنهــان و نەبینــدراوەکان . واتــە لــە نێــو ڕووبــەرە نادیارەکان یــان شــیعر دەکات بە پەیژەیەک بۆ سەرکەوتن و بەردەوام بوون ، هاوکات بە پەنجەرەیەکیش بۆ ڕوانین .. لەنێو ڕووبەری ئەم گەمە زمانەوانیە چەندین تابلۆ ڕەسم دەکات ، لە یەکەمین تابلۆ ئەوەمان پێ دەڵیت ( هێشتا کات ماوە بۆ خەون بینین ) .. لە تابلۆیەکی تر ، دەیەوێ بڵێ .. ( دوای کەمێکی تر ، ئەستێرەیەکی تر هەڵدێ ) .. یان لە تابلۆیەکی تر دیســان دەیەوێ پێمان بڵێ .. ( یەکسانی چەمکێکی وەهمیە ، ڕێگایەکی تر بدۆزنەوە بۆ بەختەوەری ..! ) تابلۆکان بەردەوامن و شیعریش هەمیشە وەرزەکان بە ڕەنگی تر پێشان دەدات ، منی شاعیریش لە نێو خەونەکانی منداڵی لاسارانە کۆڵارە دەفڕێنێ و لەنێو گەمە بێئاگاییە ئیرۆسییەکانی خۆیدا بەردەوام دەبێت .

### ٣

شـــاعیر لەم دەقــەدا ، دەیەوێت پەیوەنــدی خۆی لەگەڵ شــیعر لە فۆڕمێکی ڕەها ڕەســم بکات . یان دەیەوێت ڕووبەری شــیعر لەنێو خۆیدا بدۆزیتەوە و وێنا بکات . یان لە نێو هەســتە نەســتیەکان و هاوکات خەیاڵ و خەونەکانیش دا . بــە دیوێکــی تر شــاعیر دەیەوێت لــەم دەقەدا ، پەیوەنــدی خۆی لەگەڵ شــیعر وەک دوو هێلی تەریب بکێشــێ واتە نە شــیعر و نە ئەو ناتوانن بەبێ یەکــتری هەناســە بدەن یان باس لە بــوون و باس لە پێکهاتــەی یەکتری بکەن . دەقی تەمەن دەکرێت شوناســێک بێ بۆ شــاعیر و هەم نیشــتیمانیش .. یان ڕووبەر و مانیفێســتێک بێت کە تیایدا ، گۆشــە نیگاکانی خــۆی بۆ بوون و بۆ ژیان و بەهاکانی شــیعر و بۆ مرۆڤ و جوانی بخاتە ڕوو . هاوکات شــیعریش ئــەو ڕووبەرە بێت کە بتوانێ گەڕان و ســەفەرەکانی خۆی تیادا ئەنجام بدات .

## ٤

دەقــی تەمەن دەکرێت هەوڵێک بێــت بۆ دوزینەوەی ڕووبــەرە پەنهانەکانی زمــان لەنێو کیشــوەرە فراوانەکەی شــیعر ، یان دۆزینەوە و پێشــاندانی دیوە پەنهانەکــەی ژیــان و .. یان بــە بیندراوکردنی شــتە نەبینــدراوەکان .. یان بە مانیفێستکردنی خەونەکانی شاعیر بێت .. لەنێو گەمەیەکی زمانەوانی بەردەوام ، لەنێــو ڕووبەرە گشــتییەکانیش هەمیشــە هەســتە نەرجســیەکان بەخێرایی دەردەکەونەوە و لە پشــتی بەکاراکردنــی خەونەکان ، ڕوئیاکان و ئومێدەکان و ئــارەزووەکان خۆیان نمایــش دەکەن ، ئارەزووەکانی مرۆڤێک کە لە ئاســتێکی بەرز لە خۆیی و ژیان و خواســتەکانی دەڕوانێ ، بەمانایەکی تر ، هەڕەمی من لە دەقی تەمەن ، هەڕەمێکی باڵا و شــکۆییە ، تا کۆتایی ئەم قەســیدەیە منی شــاعیر هەر بەم شــکۆمەندییە دەمێنێتەوە . شــاعیر لە ژیان ڕانــاکات بەڵام . دەیەوێــت بڕواتە دەرەوەی ژیــان .. وەک مرۆڤێکی یاخــی دەیەوێ ، هەموو ئــەم چەمــک و پێکهاتەو کردارە دزێو نەشــیاوانەی کە ژیان ناشــیرین دەکەن ڕەت بکاتــەوە .. یــان بە مانایەکی تر ، وێنەی حەقیقەتــی پەیکەری ژیانمان لە نێو خەونەکانی بۆ بکێشــی .. شــاعیر لە ژیان ڕاناکات بەڵام ، هەمیشە بەدوای ژیانێکی باشتر و ئاسوودەتر و سەرفرازتر دا دەگەڕێ . بۆیە لەڕێگەی کردنەوەی کــۆد و میتافــۆرەکان و شــیکردنەوەی خەونەکان ، دەیەوێ لــە ژیان نزیکمان کاتەوە ، شــاعیر لــە بارێکی خودئاگا مەبەســتیەتی ژیان بــکات بە دڵبەرێکی قەشــەنگ و نەشــمیل . هەریەکێــک لــە مرۆڤەکانیــش بکاتــە ســوارچاک و ئاشــقێکی شــەیدا و بێوێنەی ئەم دڵبــەرە باڵا زڕاڤ و ڤینۆســییە . لە هەوڵی چوونە ژووانی هەتا هاتایی ، دەستڕاگەیشــتن و ڕامووســانی و تێکەڵاوبوونێکی بێ ســنوور و بێهاوتا لەگەڵ دڵبــەری ژیان .. بۆ ئەوەی لــەم ڕێگەیەوە بتوانن تــا ئەبــەد لەنێو لەزەتــە ئیرۆســییەکان و بەهەشــتی جوانییــەکان بمێننەوە .

٥

لە نێو بونیادێکی ئیستاتیکی و لەنێو ڕووبەر و فەزایەکی ئاوەڵای زمان ، شاعیر مەبەستیەتی خەونەکانی وەقسە بهێنێ و دەست لە ملی ئازادییەکانی بکات .. هەربۆیە شـیعر دەکات بە نیشتمانی خۆی .. لەنێو ئەم نیشتیمانەش دەیەوێت وەک خۆی بیر بکاتەوە و وەک خۆی بژیت یان بە مانایەکی تر ، نایەویت بوونێکی دەستبەسەر و زەلیل بێت .. شیعر دەکات بە نیشتیمانی خۆی چونکە ، دەیەویت بەوپەڕی ڕەهایی یاخی بوونەکانی خۆی بنووسیتەوە ، یان بە دژی هەموو ئەو ڕێگرییانە بوەسـتێتەوە ، کە هەمیشـە بوونەتە هۆی ئەوەی مەوداکانی ژیانی لەبەردەم بچووک و بەرتەسک بکەنەوە ، ئیتر دەیەوێت لەنیو دەقە شیعرییەکانی نمایشـی حەقیقەتـی بوونی خۆی بـکات .. یان بـە مانایەکی تـر ، دەیەوێت حەقیقەتی خۆی وەک خۆی بنووسـێتەوە .. بوخچـەی گرێدراوی ئومێدەکانی بکاتـەوە و خەم و تەنیاییەکانی خۆی بکاتە میلۆدییەکی ئیرۆسـی ، ئازارەکانی خۆی پێ برەوێنێتەوە و هاوکاتیش ، بە ڕۆشـنی قسـە و ئومێدەکانی دڵی خۆی واتـە دڵی منی شـاعیر بـکات ، چونکە بـەلای ئەو ( منی شـاعیر لەگەڵ منی مرۆڤ ) دوو کەسـی جیاوازن بەڵام لە یەک جەستەدان ، لە ڕووی بیرکردنەوە و بـاری دەروونـی و لەبـاری کەسـایەتی دا .. منی شـاعیر ڕاسـتەوخۆ لەژێر کاریگەرییەکانی نەسـتی و ئـارەزووەکان دایە بەڵام ، منـی مرۆڤ بەجۆرێک لـە جـۆرەکان لەژێـر کاریگەرییەکانـی دەرەوەدایـە .. وەک کاریگەرییەکانی (کلتـوور ، ئاییـن ، قوتابخانە ، خێزان ئایدیۆلۆژیا ... ) هەروەها لەنیو پانتایی دەق هەوڵـدەدات لە تەک گەمە زمانەوانیەکانـی واتە لەتەک فۆڕم و بونیادی زمانەوانـی دەق ، مانایەکـی نـوێ بـۆ چەمکەکانی بـوون و ژیـان و مرۆڤ

بخاتە ڕوو . لە هەمانکاتیش ، نووسین و داهێنان تەنها بریتی نین لە ڕووبەرێکی زمانەوانی لە چوارچێوەی بونیادێکی ئیستەتیکی و دوور لە بەها مرۆییەکان. بەمانای هەموو نووسین و داهێنانێک دابڕاو لە بەها مرۆییەکان یان ئامانجە مرۆییەکان دەبێتــە کردارێکــی ناتەواو یان کردارێکــی بێمانا و موجــەڕەد . لەپاڵ هەموو ئەمانەش منی شــاعیر مەبەســتیەتی لەنێو ڕووبەری ئەم دەقە دەرگا لەســەر دنیایەکی نوێی شــیعر بکاتەوە . دنیایەک پڕبێت لە هاوار و ئومێد و پرســیارە گــەورەکان ، لەســەر خەون و نیگەرانییــەکان .. چونکە شــاعیر بوونەوەرێکی نیگەرانــە یان پێکهاتەیەکی نیگەرانە لە ڕووبــەری بووندا ، هەوڵدەدات لە نێو داهێنان و دەقەکانی ، خەون و خەیاڵە جوانەکانی و هەســتە ئیستەتیکییەکانی بنووســێتەوە . وەک گەریدەیــەک بــە پاشــخانێکی مەعریفییــەوە ، بــەدوای واتــای بوون دەگەڕێت و پرســیار لە بوون و هاتنی خــۆی دەکات بۆ نێو ژیان .. ســەرەنجام لەنێو خەیاڵە فەنتازی و ئیرۆســییەکانی بە ئارامییەکی دەروونی و ڕۆحــی دەگات ، لەلای شــاعیر هەمــوو دەقێکی ئەدەبــی هەڵگری جۆرەها میتافــۆر و ئاماژەی جیــاوازن ، ڕەنگە لەیەککات لە ئەنجامــی بەریەککەوتنی وشــەکان لەنێــو پەیوەندییە نوێیەکانــەوە بە پێی جیــاوازی کات دەربکەون . لەنێو هەر دەقێکی نویش نائاگایی شــاعیر ڕۆڵی سەرەکی و ڕاستەوخۆی هەیە، لــە هەڵڕشــتن و یاخود کردنەوەی دەرگا بە ڕووی ئامــاژە و کۆدە نوییەکان دا ، لەچوارچێوەی گەمەیەکی ئیســتاتیکی لەنێو ڕووبەر و بونیادی زمانی دەق دا .

**کۆتایی نیسانی ٢٠١٤**

## دیمانە / (ناڵە حەسەن و دەقی تەمەن)

### ئامادەکردنی : فەهمی نەبی

ماوەیەکـی زۆرە مـن خوێنـەری دەقـە شـیعرییەکانی ( ناڵە حەسـەن )م، هەمیشـە بە دەنگێکـی جیاوازم زانیـوە چونکە زۆرتر لە هەر شـاعیرێک توانیویەتی ڕەسمی واقیعی ژیانی خۆی لە نێو شیعرەکانی نیشان بدات . ئەوەش هۆکارێکی کاریگەرە کە من هەمیشـە وەک پێوانەی ڕاستەقینەی نووسینەوەی خود تەماشـای دەکەم . لە فەیسبووک هەمیشە دوای هەواڵ پرسین ، پرسیاری دەقـی نوێم لێکـردووە . ئەمجارەیان دەقێکی نوێی بۆ نـاردم ( من ... دەقی تەمەن ) هەر ئەوکات دوای خوێندنەوە نوقمی گفتوگۆیەکی زۆر بووین ، بۆیە بڕیارماندا لە دەرفەتێکی نزیکتر قسـەی زیاتری لەسەر بکەین ، دوای ئاڵوگۆڕی چەند پرسـیارێک کە لەلام دروسـت ببوو ، ئەم گفتوگۆیەی لێهاتە بەرهەم کە ئێوە دەیخوێننەوە .

**-پرسـیار : بۆچی ئەم هەوڵەی خۆتت ناو ناوە ( دەقی تەمەن ) ..؟ یان لە دەرەوەی ئەم ناونیشانە و ڕوونکردنەوەکە بۆ دەقەکە .. تۆ ئەمە بە مانیفێستی شیعری خۆتی دەزانی ..؟**

**ناڵە حەسـەن :** لە سەرەتای شیعرەکەمەوە تا کۆتاییەکەی هەستم دەکرد لە نێو ئەتمۆسفیرێکی شیعری جیاوازدام ، هەستم دەکرد سەرسامانە خۆم ڕەسم

دەکـەم و لەگەڵ خۆمـدا دەدوێم بە تایبەت دوای تەواو بوونی شـیعرەکە کە ناوم نا ( من ) .. هەسـتم دەکرد لەو شـیعرە بەدەر لـە جیاوازییەکانی زمان و سـتایل ناتوانم دوا دێری بۆ بنووسـم یان دوا نوختەی بۆ دابنێم . واتە دەقێکە کراوەیـە و تـەواو نابێت ، نەک بە بەشـێک یـان بە دووان دەقێکـە تا ئەبەد دەکرێ بەشەکانی یەک بەدوای یەکدا بێن.. دوای ڕامان و وردبوونەویەکی زۆر ، گەیشتمە ئەو باوەڕەی کە چ سایکۆلۆژیەتی دەقەکە چ بارە زمانەوانیەکەی چ ستایل و شێوازی نووسینەکەی ئەوە دەخوازێ ئەم دەقە ناوێکی تایبەتی لێبنێم و وەک تەجروبەیەکی شـیعری نوێ ڕایبگەیەنم .. لەسـەرەتا بیرم کردەوە ناوی بنێم ( دەقی ژیان ) بەڵام لەگەڵ ئەم ناوە ڕووبەڕووی کۆمەڵێک ئیشکالیاتی تر دەبووم کە نەمدەویست لێیان نزیک ببمەوە . دواجار بەوە گەیشتم ناوی بنێم ( دەقی تەمەن ) . دەربارەی ئەوەش کەئایا ئەم ڕوونکردنەوەی نووسـیومە بە مانیفێستی شیعری خۆمی دەزانم ، من دەڵێم نەخێر ، دیارە ئەم ڕوونکردنەوەیە بەشـی تری بە دوادا دێت تا دەبێت بە مانیفێسـتێکی گونجاو بۆ دەقی تەمەن ، بـەڵام هەرگیز مـن ئەوە بە مانیفێسـتی شـیعری خۆم نازانـم ، چونکە من پێموایە ، من لە ئاسـتێکی فراوانتر لە چوارچێوەی مانیفێستێکی دیاریکراو ئیش لەسـەر شیعرەکانم دەکەم ، من بە سـتایلی جۆراوجۆر دەنووسم ناتوانم لەنێو سـتایلێکی دیاریکراو خـۆم و هەوڵەکانی خۆم بەر تەسـک بکەمەوە ، دەکرێ ئەوە مانیفێستێک بێت بۆ یەکێک لە هەوڵەکانم ، واتە مانیفێستێک بێت تەنها بۆ ( دەقی تەمەن ) و هیچیتر .

**- پرسـیار : ئایا لە هەموو شـیعرێک شـاعیر خۆی نانووسـێتەوە یان ئیش لەسەر خۆی ناکات ؟ مەبەستمە بڵێم جیاوازی ئەم شیعرەت لەگەڵ شیعرەکانی تـرت لـە کوێدایە ؟ یـان ئێمە بۆ خۆمان بنووسـینەوە لە کاتێکـدا وەزیفەی نووسینەوەی شتەکانیتر تەواو نەبووە ؟**

-**ناڵە حەسەن :** بێگومان منیش دەڵێم لە هەموو شیعرێک شاعیر هەوڵدەدا خۆی بنووسێتەوە بەڵام ، لەو شیعرە نووسینەوەی خود جیاوازە ، شاعیر لەم دەقە بە شێوەیەکی زۆر چڕ ئیش لەسەر خۆی دەکات ، تەرکیزی زۆر دەکاتە سەر ناوەوەی خۆی غەریزەکانی خۆی باری دەروونی خۆی خەون و خەیاڵ و ئومێدەکانی خۆی تەنانەت نهێنیەکان و شتە تایبەتیەکانی خۆی یان پەیوەندی خۆی بە دەرەوە و بە چەمکەکانی تر ، بۆ نموونە دەربارەی عەشق ، شاعیر لەم دەقەدا بە نێو بەرینایی ڕووبەری عەشق سەفەر ناکات ! لەنێو ئەو رووبەرە دەمێنێتەوە کە پەیوەندی بە خۆی هەیە واتە تەنها دۆڕانەکان و یان فرینەکانی خۆی لەنێو رووبەری عەشق دەنووسێتەوە، واتە ( هەر خۆیی و هەر خۆیی و هەر خۆی ) کە ئەمەش یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی ئەم شیعرە .. جیاوازییەکی تر ، هەر بەناوەکەوە دیارە ( دەقی تەمەن ) دەقێکە تەواو نابێ و لەگەڵ تەمەنی شاعیر دایە ، هەروەکو گوتم ناتوانم دو ادێر و دوا نوختەی دیاری بکەم .. مەرگی شاعیر دەبێتە دوا دێر و دوا نوختەی ئەم دەقە ..! ئەمەش لە هیچ دەقێکی تری خۆم یان لەهیچ دەقی هیچ شاعیرێکی تر ئەمەم نەبینیوە یان ئەو بارە نەرجسیەتەی شاعیر کە منی خۆی لە سەرووی منەکانی تر دەبینێ یان ئەو بوونە نەرجسیەی خۆی بە بوونێکی پیرۆز وەسف دەکات ! دەربارەی ئەوەش ئێمە بۆ خۆمان بنووسینەوە لە کاتێکدا وەزیفەی نوسێنەوەی شتەکانی تر تەواو نەبووە ، من بە دڵنیاییەوە دەڵێم شتەکانی تر تەواو نابن ، حیکایەتی شتەکانی تر و حیکایەتی ژیان حیکایەتێکی بەردەوامە . جا بۆ ئەوەی لە خۆمان و شتەکانی تر تێبگەین دەبێ لەسەرەتا خۆمان بنووسینەوە ، وە پەیوەندی خۆشمان بە شتەکانیتر ڕەسم بکەین کە ئەمەش وەزیفەی نووسینە و شیعریش زۆر تایبەتمەندانە ئیش لەسەر ئەمە دەکات .

-**پرسیار : لە ڕوونکردنەوەکەت نووسیوتە ( شاعیر لەم دەقە منی خۆی لە سەرووی هەموو منەکانی دەوروبەر دەبینێت ) لە پشتی ئەم دەربڕینەت**

**دەتەوێت چیمان پێبڵێیت ؟**

- **ناڵە حەســەن :** دەمەوێ بڵێم ئەو ڕۆژگارە بەســەر چووە بڵێین ( کوردم و ناتوێمەوە ناتوێمەوە ..! ) ڕۆژگارە سەختەکان بەسەرچوون و ئێمەش نەتواینەوە .. دەمەوێ بپرســم ئێســتا چۆن لە خۆمــان و بوونمان دەڕوانین ؟ چ ئاســت و تەوەقوعێکــمان هەیە بۆ خۆمان و بــۆ ژیانمان ، دەمەوێ بزانــم لەم دەورانی دوای پۆســتمۆدێنیزم و لە نێو ئەم هەراو زەنــای تەکنۆلۆژیایە خۆمان لە کوێی هاوکێشــەکان دەبینین ..؟ شــاعیر لەم دەقەدا ، بە دیدێکــی مۆدێرنەوە ، منی خۆی لە ئاستێکی بەرز دەبینێت هێندە بەرز تا ئاستی ئەوەی هەموو خۆشیەک و بەختەوەریــەک و جوانیەکی ژیان بۆ خۆی بــە ڕەوا دەبینێت لەهەمانکات ، خوازیارە هەر تاکێکی کۆمەڵگاکەی لەم ئاستە بەرزە بۆ خۆی و ژیان بڕوانێت ،

پێــی وایــە وەکو کورد کاتی دەســت ماچکــردن و چەمانەوە بــۆ بەرامبەر بەسەرچووە ..! تاکی کورد لە بەرزترین ئاست تا نزمترین ، هەر جێگاو ڕێگایەک و هــەر پلەوپایەکی بەرپرســیارێتی هەبێت ، دەبێت خۆی لەم ئاســتە بەرزەدا ببینێت بەتایبەت لە بەرامبەر ئەوانیتر . یان پێویســتە تاکی کورد دەستبەرداری ئەم ڕۆحە شــەرمنۆکی و خەجولیە ڕۆژهەڵاتیە بێت وا خەریکە ڕۆح و بوون و خەونەکانمان وێران دەکات .

**- پرســیار : تــۆ بەم دەقە دەتەویــت تەجاوزی قۆناغــی جیلی پێش خۆت بکەیت»**

- **ناڵە حەســەن :** من ناتوانم بڵێم بۆ ئەم مەبەســتە ئەم دەقەم نووســیوە ، بەڵام ئەگەر شــتێکی لەم بابەتەم کردبێ ئەوە مایەی خۆشــحاڵیمە . دیارە ئەوە مافی هەر نووســەرێکە کە بەم ئومێدەوە بنووسیت دیارە ئەم مافەش لە خۆم ناسێنمەوە . بەڵام داهێنان لای من شتێکی لەوە گەورەترە بە خاتری تێپەڕاندنی نەوەی پێشخۆمان یان بۆ ئەم مەبەستە بنووسین ..

- حەقیقەتێک هەیە دەمەوێ ئەوە زۆر بە ڕاشــكاوی بڵێم من لەو ڕۆژەوەی دەســتم داوەتە قەڵەم خەمی داهێنان یەكێک بووە لە خەمە هەرە گەورەكانم .. لە پڕۆســەی نووسینم دا من هەمیشە، هەوڵم داوە كۆپی هیچ كەسێک نەبم ، دەنگێكی جیاواز بم و لە هیچ كەســێكی تر نەچم ئەوەشــم لەنێو دەقەكە بە ئاشكرا ڕاگەیاندووە كە دەڵێم ( من لە هیچ كەسێكی تر ناچم لە خۆم نەبێت..) .

**- پرســیار : نووســینەوەی ( مــن ) لــە قۆناغێكی وەک ئێســتا كە خودانی چەندین كتێبی شیعریت غەدر نییە لە ڕابردوویەک كە ڕۆیی و نەتنووسینەوە یان ئەوە كامل بوونی ئێستایە ؟**

- **ناڵە حەســەن :** بە بڕوای من داهێنــان و نوێبوونەوە پەیوەندی بە تەمەن و كتێب و هیچ قۆناغێكەوە نییە ، یان لە هەر چركەســاتێكی تەمەن كەســێک بیەوێ داهێنان بكات ئەوە هیچ جێگای ئەســەف و غەدر نییە بە پێچەوانەوە ، جێگای ئیفتیخار و مایەی شادومانی و پێشوازییە .. من چیبكەم خۆزگە دە ساڵ بەر لە ئێستا ئەم دەقەم دەنووسی !

**- پرســیار : ئەم دەقە لەگەڵ تەمەنت دایە و لە هەمانكاتیش دەتەوێت لە نووســینی شــیعرەكانی ترت بەردەوام بیت . مەبەســتمە بڵێم ، ئەم تەجروبە شیعریە تازەیەت هیچ لایەنێكی نێگەتیڤی لەسەر پرۆژە شیعرییە ئاساییەكانت نابێــت ؟ یان بــە مانایەكی تر ، هیــچ ڕێگریەک لەبەردەم شــیعرەكانی ترت دروست ناكات ؟**

- **ناڵە حەســەن :** ڕێک وایە ئــەم دەقە لەگەڵ تەمەنم دایە ، دەشــمەوێت لە نووســینی شــیعرەكانی ترم بەردەوام بم . بەڵام دەربارەی لایەنی نێگەتیڤی ئەم تەجروبەیەم ئەوەی تا ئێســتا بینیبێتم یان هەســتم پێــی كردبێ ئەوەیە ، پڕۆســەی نووسینی شــیعرەكانی ترم هێواشــتر دەكات چونكە ، ئەم دەقەش بە

ئەندازەی خۆی کاتی لێمدەوێت ، وە دەبێ ئەم ئیعترافەش بکەم من کەسێکم کەم دەنووسم هەر دەقێکی شیعریم دوو مانگ تا سێ مانگ دەخایەنێت ئەگەر زیاتریش نەبێت . خاڵێکی تر / لەم سێ چوار مانگەی دوایی واتە لە سەرەتای بەشی یەکەمی ( دەقی تەمەن ) تا ئێستا ( چونکە ئێستا لە بەشی دووەمی ئەم دەقەدا ئیش دەکەم ) یەک دووجار خەیاڵێکی نوێی شیعریم تواندۆتەوە لەنێو ئەم دەقەدا ، واتە لەگەڵ خەیاڵە نوێکەم بەردەوام نەبووم تا بیکەم بە شیعرێکی سەربەخۆ . من پێموایە بەرچاوترین لایەنی نێگەتیڤی ئەم تەجروبەیەم لەم خاڵەدایە بەڵام ، بەپێی توانام هەوڵدەدەم کاریگەریەکان لە ئاستێکی زۆر نزمدا بن .

**- پرسیار : بە بۆچونی من ( نەرجسیەت ) ی تۆ لەم دەقەدا لەوپەڕی قووڵی دایە .. ئایا نووسینەوەی ( ئەو ) کۆتایی هات ؟ مەبەستمە کەسی دووەمی تاک کاراکتەرێکی ئامادەیە لەنێو دەقەکانی تۆدا ! .**

- **ناڵە حەسەن :** ئەو بوونە نەرجسیەی من لە هەموو شیعرەکانی تریشم دا هەر هەبووە وە ئەگەر لەم دەقەم گەیشتۆتە ئەوپەڕی یان وەکو تۆ دەڵێی لەوپەڕی قووڵیدایە ، من لەم حەقیقەتەی خۆم ڕاناکەم هۆکارەکانیش چ لە ڕوونکردنەوەکەم و چ لە پرسیارەکانی پێشووتر وەڵامم داوەتەوە بە پێویستی نازانم لێرەدا دووبارەیان بکەمەوە ، دەربارەی چیرۆکی من لە گەڵ ( ئەو ) هەرگیز کۆتایی پێنەهاتووە ئەو لە دەقەکانی تر و لەو دەقەش هەر لە گەڵمدایە .. ئەوەتا لەسەرەتای دەقەکەدا دەڵێم ...

تاک تاک تاک
تک تک تک
تۆ تۆ تۆ / تۆ تا ئەبەد تۆ
یان لەبەشی دووەمی ئەم دەقەدا لە شوێنێکدا دەڵێم ...
من حەزدەکەم هەموو ژیان لەنێو تۆدا بتوێتەوە
تۆش لەنێو من
من حەزدەکەم تۆ لە هەموو مەخلوقاتێک ئاسوودەتر بیت
منیش لە تۆ ..!

ئەوەتـا دەبینین لەو دەقەش ئەو هەر لەگەڵمایە ، ( ئەو ) هێندە مەحبوب و ئازیزە تا ئەو ئاسـتەی دەمەوێـت ژیان لەنێو ئەودا بتوێتـەوە یان دەخوازم لە هەموو مەخلوقاتێک ئاسـوودەتر بیت بەڵام ، لەگـەڵ ئەوەش واز لە ڕۆحە نەرجسیەتەکەی خۆم ناهێنم و دەمەوێت ( ئەو ) یش لەنێو مندا بتوێتەوە یان دەمەوێت لە ئەو ئاسـوودەتر بم . بەڵام لەنێو ئەم دەقە پەیوەندی من لەگەڵ ئەو لە ئاسـتێکی تردایە ، لەگەڵ ئەو لە عەشـق دام لەژووان دام لەهەمانکات لە ململانێیەکی سـەخت و دژواریش دام ، عەشـق لەم دەقەدا لە پێناو مانەوە نییـە ، بەڵکو لە پێناو جوانکردن و بە ئیرۆسـی کردنی ژیـان و لە پێناو بەها مرۆییەکانە .

**-پرسـیار : ڕەهەندەکانی کەسـایەتی لە دیدی فرۆیدەوە ( ئەو ، من ، منی باڵا) یە من لەبەردەم بە کۆمەڵایەتی بونی تاک و تێگەیشتنی دەرەوە و ناوەوە لەبەرامبـەر منی باڵا کە هەمیشـە خۆی لە سـەرەوەی هەرەمی کەسـایەتی دەبینێتەوە ئەو دەقە لەسـەر نەخشـەی ( من ) دا لە کوێوەی نەرجسـیەتی تۆدایە ؟**

- **ناڵە حەســەن :** من ی ( دەقی تەمەن ) ، ( من ) یّکی باڵایە و لە ئاســتێکی بــەرز دەڕوانــێ ، شــانازی و ئیفتیخارێکی بێ وێنە بەو منــە و بە بوونی خۆی دەکات ، ئەو منە منی شاعیرە ، ئەم شانازی و بەرز ڕوانینەش بەهۆی نووسینی شــیعرەوەیە ، وەک لە ڕوونکردنەوەکەدا هاتووە ( من شــیعر دەنووسم کەواتە من هەم ) . شــاعیر لێرەدا ( من ) یّکی داهێنەر و خالیقە ، شــتەکان وەقســە دەهێنــێ و ڕۆحیان دەخاتە بەر . بۆیە شــاعیر داوا دەکات بوونێکی ڕەها بێت و خــاوەن هەموو مافێک و ئازادیەک بێــت . بەڵام ئەو دیدگا و تیۆرەی فرۆید بۆ کەســایەتی و ناسینی سروشتی مرۆڤ و هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی ، کە بۆ ئەم مەبەســتە مێشکی مرۆڤی دابەشــکردووە بۆ سێ بەش ئەویش ( من ، منی باڵا ، ئەو ) هەریەک لەم بەشــانە لە کەسێکی ئاسایی و تەندروست دەبێت لە هاوســەنگیەکی گونجاو دابن ، چونکە ناهاوســەنگی و نارێکی لە هەریەکێک لەم بەشــانە ، دەبێتە هۆی نارێکــی باری دەروونــی و لێکەوتنەوەی چەندین نەخۆشــی دەروونی . هەریەک لەم بەشــانەش بۆ نموونە « ئەو ( ئید ) بەر لە هەموو بەشەکانی تر ، لەگەڵ لەدایکبوونی کۆرپە لەدایک دەبێت ، تەواو لەنێو ڕووبەری نەســتی دایــە واتە ڕووبەری بێئاگایی و لاشــعووری ، لەژێر کۆنترۆلی پرێنســیپی دەروون و هەســت و ئارەزووەکانــی دایە ، بە هیچ شــێوەیەک نە لەگەڵ واقیعی دەرەوە ڕووبەڕووە نە گوێی بە هیچ فەرمانێک دەدات . شاعیر چ لە شیعرەکانی تری چ لە دەقی تەمەن خۆی زۆر بۆ بێئاگایی شل دەکات واتە توانــا و خەیــاڵ و ڕەفتار و بیرکردنەوەکانی لە ژێر کۆنترۆلی ( ئەو .. ئید ) دایە .. ئــەو منە باڵایەی دەقی تەمەن بە ئاراســتە و تەوژمی ( ئــەو ) کار دەکات ، بۆیە تەنها گوێ بە خواست و غەریزەکانی خۆی دەدات و ئیش لەسەر چەمکە ئیرۆســیەکان دەکات ، یان منی خۆی لە ســەرووی هەموو منەکانی تر دەبینێ و دەڵــێ ( هەر خۆم و هــەر خۆم و هەر خۆم ... خۆمی تاک و تەنیا ... خۆم تا ئەبەد خۆم ..! ) . کرۆکی نەرجسیەتەکەش ئەلێرەدایە .

**- پرسیار : مەبەستت لەوەدا چییە کە دەڵێی شاعیر خۆی نابەستێتەوە بە چرکە ساتێکی دیاریکراو یان زەمەن پێکهاتەیەکی ناکاریگەرە لە نێو ڕووبەری دەقدا ؟**

- **ناڵە حەســەن :** مەبەستم ئەوەیە و دەمەوێ بڵێم ، ڕاستە شاعیر لەم دەقە خۆی دەنووسێتەوە و هەموو تەرکیز و خەیاڵەکانی لەسەر خۆیەتی بەڵام ئەمە بە مانای نووســینەوەی ژیاننامــە نییە تا لەمنداڵیەوە دەســت پێبکات و ئینجا هــەرزەکاری و لاوێتــی و تا کۆتایی .. بەڵام لە دەقــی تەمەن ، زەمەن یان کات بەم ئاراستە ڕێکە نارِوات .. من وای دەبینم وەک چۆن لە کرداری زاوزێ لە کاتی توانەوەدا بە ملیۆن سپێرم دەڕژێ بەڵام خێراترینیان خۆی دەگەیەنێتە هێلکەکە و کرداری پیتان ڕوودەدات . ئەمەش بەهەمانشێوە ، لەکۆی کۆمەڵێک ڕووداو و بیرەوەری کامەیان کاریگەری زیاتــر بێت ئەمیان خۆی دەگەیەنێتە هێلکۆکەی خەیاڵی شــاعیر و خەیاڵی شــاعیر ئاوس دەکات .. بۆیە پەیوەندی بە زەمەنەوە نیە و زەمەن پێکهاتەیەکی ناکاریگەرە .

**- پرســیار : ئەم دەقە لە قالبی پۆستەرە شیعرە نووسینەوەی ( من ) هەروا بەردەوام دەبێت یان نەفەسی درێژ و شێوازی پێشتریشت بەکار دەهێنی ..؟**

- **ناڵە حەســەن :** ڕاســتیەکەی نامەوێت یــان بە گونجاوی نابینم شــێواز و فۆرمێکــی دیاریکــراو بۆ ئەم دەقەم دابنێم .. من پێمباشــە وەک چۆن دەقەکە کراوەیــە و بــەردەوام دەبێــت ، ئاواش فۆرم و شــێوازێکی کــراوەی هەبێت . ڕاســتە بەشی یەکەم و تەنانەت بەشی دووەمیش لە شێوەی کۆپلە کۆپلە کەتۆ پێی دەڵیی پۆســتەرە شــیعر دەڕوا ، بەڵام من ئەوە نازانم و بۆم ڕۆشن نییە لە داهاتوودا بە چ زمانێک و بە چ فۆڕمێک درێژە بەم دەقەم دەدەم ، ئیتر ســڵاو لە داهێنان .

# پەپوولەیەک لە ڕەنگی مانگ

تۆ دەتوانی بە نێو
وەرزەکان و ساڵەکان و سەدەکان تێپەڕیت
بە بێ ئەوەی ئاوڕ لە خەمە سپییەکانی تەمەن بدەیتەوە
یان بە نێو کۆڵانەکانی ڕەشەبا دا تێپەڕیت
بە بێئەوەی ئاوڕ لە ئایکۆنەکانی مردن بدەیتەوە
تۆ دەتوانی
بە نێو شەقامەکانی ئاگردا پیاسە بکەیت
یان لە نێو باخچەکانی بروسکە بمێنیتەوە
یان /
چاوە نەرمەکانی مانگ بکەیت بە ماڵی خۆت و

بە دار چروەکانی
حەوشەی پشتەوەی ماڵی خوداش
کەپرێک بۆ خۆت دروست بکەیت
بە بێ ئەوەی
ئاوڕ لە باریکە ڕێیەکانی تەنیایی بدەیتەوە
تۆ دەتوانی بە نێو
دوای نیوەڕۆیە تەماوییەکانی عەشقدا ڕەت ببیت و ون نەبیت
یان بە نێو
خەرەندە قووڵ قووڵەکانی خەیاڵدا ڕەت بیت و ون نەبیت
یان بە ژێر
ڕێژنە تەرزەی نێو دیوانە شیعرییەکانی مندا ڕەت بیت و
ئاوڕێکیش لە نائومێدییەکانی من نەدەیتەوە
ئەی مەریەمیترین سەروەری من
تۆ دەتوانی
هەموو کیشوەرەکان و ئۆقیانووسەکان

بکەیت بەیەک
یان هەموو ئەستێرەکان لەیەک نزیک بکەیتەوە
یان ڕەنگەکانی پەلکەزێڕینە بگۆڕیت و
بارانیش بە جۆرێکیتر لێوی گژوگیا ماچ بکات
بە بێئەوەی کلۆبەفرەکانی بێهوودەیی
زەردەخەنە گەرمەکەی سەر گۆنا و
نیگا نەرمەکانی چاوەکانت بشێوێنن
تۆ دەتوانی
کراسی پایز لەبەرکەیت و
ڕوخساریشت وەک ڕوخساری مانگ / دەرکەوێت
کراسی بەفر لەبەرکەیت و
ڕوخساریشت وەک ڕوخساری خۆرەتاو / بمێنێتەوە
کراسی سپیدە لەبەرکەیت و
لێوەکانیشت وەک چرکە ساتەکانی غروب
سوور سوور بن

کراسی شەو لەبەرکەیت و
چاوەکانیشت
پەرستگایەک بن لە ڕووناکی
تۆ دەتوانی
ئاگر ئاوسکەی لە با
مردن ئاوسکەی لە عەشق
درەخت ئاوسکەی لە ئەستێرە
من ئاوسکەی لە جوانییەکانی خۆت
خۆشت ئاوسکەی لە خەونەکانی من
ئەی سەروەریترین سوڵتانەی من
تۆ کەسێکی هێندە گەورەی
بە تەنیا لە نێو دڵی من جێگات نابێتەوە
دەبێ دڵی هەموو دنیات بۆ قەرزکەم
گەر لەوێداش جێگات نەبوویەوە
بەبێ هیچ شک و گومانێک

دەبێ دڵی خوداکانت یەکبەدواییەک
بۆ ئاشتکەمەوە ...!

ئەی خودای من تا ئەبەد خولیای من بە
ئەی مەستانەی من تا ئەبەد مەستی من بە
ئەی شاگوڵی من تا ئەبەد شەیدای من بە
ئەی پەریزادەی من تا ئەبەد پەروانەم بە
( ئەی عەشقی من تا ئەبەد عاشقم بە )
وەکچۆن من بۆ هەمیشە و تا ئەبەد
خولیا و مەست و شەیدا و پەروانە و عاشقی تۆم ...!

**کۆتایی نۆڤەمبەری ٢٠١٤**

# ئایەتەکانی تەنیایی

من تەنیایی خۆمم خۆشدەوێت
چونکە تەنیاییم
پڕە لە مۆرفیمە ناسکەکانی شیعر
پڕە لە خەیاڵە جوانەکانی عەشق
من لە تەنیاییمدا
ژوورەکەم بە گوڵ دەرازێنمەوە
چراکان دادەگیرسێنم
مەعبەدەکانی خەیاڵم
پڕ دەبن لە نووری خودا
من لە تەنیاییمدا
زێتر لە نێو زەردەخەنەکانی پایز و

لە نێو خەونە خەملیوەکانی مانگ دەمێنمەوە
تا دەبم  بە پێدەشتێک لە گوڵەگەنم
یان دەبم بە ئەستێرەیەکی گەڕۆک
لە ئاسمانی هەموو کیشوەرەکان دەردەکەوم
دەمەوە بە منداڵە چەتوونەکەی جاران
سەر بە کۆشی دایکم دەکەمەوە و
تا پڕ دەبم لە هەناسە فێنکەکانی میهر
من لە تەنیاییمدا
پەپوولە نامورادەکان و
کاراکتەوە ئەشقیاکانی
نێو ڕۆمانەکانی عەشق دەهێنمە قسە
گوێ لە غەریبترین سەمفۆنیای بەرد و
لە خەمناکترین لاوکی
دار سنەوبەرە پیرەکان و

لە حیکایەتی
( غەمگینترین باڵندەی ناو کۆشکەکان ) ڕادەگرم
یان / لە دەربەندەکەی نێو کتێبان
کەپرێک هەڵدەدەم
زێتر وابەستە دەبمەوە بە ژیان
من لە نیو تەنیاییمدا
بێدەنگ بێدەنگ
لە نێو هاوارەکانی ڕەشەبا دەمێنمەوە
تا حەزە ئیرۆسییەکانم گەرمدادێن
سەر بە هەموو باخچەکاندا دەکەم
تا پڕ دەبم لە بۆنی ڕەشە ڕەیحانە
یان هەندێکجار
میلی کاتژمێرەکان دەوەستێنم
تا کات بە مردوویی بە بەردەمم تێنەپەڕێ

من پێشتر زۆر لە تەنیاییم دەترسام
وامدەزانی گەر تەنیابم
ئیتر لە نێو شەوەکانم
تریفەی مانگ دەرناکەوێت و
دەرگای هەموو جێژووانەکانم بە ڕوو دادەخرێن
جارێکی تر ناگەڕیمەوە بۆ وڵات
مردن تا ئەبەد لە نێو ژیانم دەمێنێتەوە
پێشتر لە نێو تەنیاییمدا
لە هەموو شتێک ڕامدەکرد
لە ئاگر لە ئاو لە بەفر
لە خۆم و لە خەونەکانم
دوور دەکەوتمەوە
پڕ دەبووم لە گومان
پڕ دەبووم لە فۆبیا
پڕ دەبووم

لە تەمە سپییەکانی نیگەرانی
بەڵام ئێستا
من دەمەوێت ئایەتەکانی تەنیاییم
لەنێو کتێبە سەوزەکانی عەشق
وەک دڵۆپە شەونمێکی سەر لێوی گیا
هەموو بەیانییان لەگەڵ دەرکەوتنی خۆرەتاو
بدرەوشێنەوە
من ئێستا لە نێو تەنیاییمدا
دەمەوێت بۆ هەموو ژیان بجەنگم
نەک تەنیا بۆخۆم
دەمەوێت گۆرانی بۆ هەموو
باڵندەکان و دەریاکان و وەرزەکان و
بۆ هەموو زیندەوەرەکان بڵێم
من ئێستا
هەر شاعیرە ڕۆژهەڵاتییەکەی جارانم

لە هەمان ماڵ و لە هەمان مەملەکەتی غوربەتم
لەسەر پشتی هەمان شەپۆلە ئاوسەکانی دوێنێم
هەموو شتەکان وەک خۆیانن
بەڵام ئێستا
لە گۆڕەپانی تەنیاییم
من کەسێکی ترم
بە زمانێکی تر دەدوێم
تەنانەت /
ڕەنگی تابلۆکانم و
سەما و ئاوازی شیعرەکانم
بەجۆرێکی تر دەبیندرێن
من ئێستا لە نێو تەنیاییمدا
ئاوەدانیترین نیشتیمان و
پڕ شەپۆلیترین ئۆقیانووسم

بێدارترین ڕووبار و
بێهوودەترین تاڤگەم
بۆیە وا هەستدەکەم
من ( بەختەوەرترین مرۆڤم )
کە دەبینم
ژیان و عەشق
بە هەموو بەرینایی خۆیان
لەنیو تەنیایی من ڕاکشاون

**نۆڤەمبەری ٢٠١٤**

# عەشق کتێبێکە پڕ لە وەهم

ئەی مانگی من
ئەی هاوڕازی شەوە تاریکەکانم
ئەی هاودەمی سەفەرە دوور دوورەکان و
ئەی پەڕوباڵی فڕینە پڕ ترسەکانم
دوورکەوە لێم
دوور دوور دوور دوور دوور
دوور / بۆ ئەودیو سنووری ئەستێرەکان
ئەودیو سنووری وەرزەکان و کیشوەرەکان
ئەودیو سنوورەکانی ژیان

دوور تا ئەوپەڕی
ڕووبەرەکانی ڕەشبوونەوە
دوور تا ئەوپەڕی
ڕووبەرەکانی مردن

ئەی مانگی من
چیتر زەردەخەنەکان و سپییە نیگاکانت
بوخچەی ئارەزووەکانم ناکەنەوە
دەمارەکانی عاتیفە و
غەریزە ئیرۆسییەکانم ناهێننە سەما
چیتر ئەو بێدەنگییە حەسرەتاوییەت
حیکایەتەکانی عەشقم بۆ ناگێڕێتەوە
چیتر بێهوودەییەکانت هێزم پێنابەخشن
چیتر ڕووتبوونەوە و جوانی مەمکۆڵەکانت
لەنێو شیعر و قەسیدەکانم نامهێننە قسە

ئەی مانگی من دوور کەوە لێم
دوور دوور دوور
چیتر ڕووناکی چاوە سەوزەکانت
لە نێو /
پایزی تەمەنی من نابریسکێنەوە
چیتر قەدەری خۆم
لەنێو تابلۆی خەونەکانی تۆ نابینمەوە
ئەی مانگی من دوورکەوە لێم
تۆش وەک عەشق کتێبێکی پڕ لە وەهم
تۆش وەک ئایەتە ئاسمانییەکان
بە مۆرفیمەکانی وەهم و
بە ڕێنووسە ئەسمەرییەکانی با نووسرایتیەوە
دوورکەوە لێم
چیتر ئایندەی خۆم لەنێو
ئایەتەکانی نێو دڵی تۆ ناخوێنمەوە

لە نێو نیشتیمانی شیعری من
چیتر تۆ ناتوانی
عەشق و باران و ڕووبار بهێنییە سەما
بروسکە و شەپۆلەکان و تاڤگەکان بهێنییە گڕ
تۆ ناتوانیت لە دەرەوەی شەوەکانی ژیانم دەرکەویت
لەودیو تخوبەکانی ڕەشەبا
گومانەکان و خەونەکانم ڕەنگ بکەیت
من هەموو ژیانم بە تۆ بەخشی
نەمتوانی تەلیسمی بێدەنگییەکەت بشکێنم
من هەموو ژیانم بە تۆ بەخشی
نەمتوانی لە خۆمت نزیک بکەمەوە
من لەنێو هەموو
قەسیدە و دیوانە شیعرییەکانم تۆم نووسییەوە
کەچی نەمتوانی بۆ تەنها جارێکیش
ڕەنگی نێو چاوەکان و

یان نیگاری شێوە و ڕوخسارت بگۆڕم
ئەی مانگی من
هێندە بە زمانی جودایی گۆرانیت بۆمگوت
تا وام لێهات
بووم بە پەیکەرێک لە گومان
لە ژیان و لە خۆم و لە هەمووکەس دوورکەوتمەوە
دوور دوور دوور / تا ئەودیو ڕووبەری تەمە سپییەکان
دوور دوور دوور / تا ئەودیو ڕووبەری خەونە خۆڵەمێشییەکان

ئەی مانگی من
چەندین ساڵە بە بێدەنگی
زەردەخەنە و نیگاکانمان دەگۆڕینەوە
چەندین ساڵە بە بێدەنگی
ئاهی هەناسە ساردی و

نائومێدییەکانمان دەخۆینەوە

تا ئەو دەمەی

بێدەنگی بۆتە زمانی نێوانمان

بۆتە زمانی شیعر و عەشق و خەونەکانمان

ئەی مانگی من

من لە نێو شیعرەکانم وەقسەهاتم

تۆش بە بێدەنگی مەسیجێکت بۆ ناردم

من و خۆت لە یەکتر دوورتر کردەوە

بە بێدەنگی

جگە لە دوو دڵۆپە فرمێسکی سەرگۆنات

هیچی ترت نەبوو پێمببەخشی

ئەی مانگی من

من لە مەودوا

حیکایەتی ئەو عەشقەی خۆم

لەنێو کتێبێکی تر دەنووسمەوە
پەنجەرەی تەنیایی خۆم
بە ڕووی ئاسمانێکی تر دا دەکەمەوە
کە لەوێدا تۆ هێندە دوور بیت
وەک خاڵێکی بچووک بچووک بچووک
ئاسمانێک پڕ بێت لە
ئەستێرەی ڕەش
پڕ بێت / لە هەور و لە پەلکەزێڕینەی ڕەش
لە مەودوا
من قەدەری خۆم بە دنیایەکی تر دەسپێرم
کە پڕ بێت /
لە خۆرەتاو و
لە خەون و
لە خۆزگەی سپی
لەوێدا / مانگ و عەشق

کتێبێک بن
پڕاوپڕ لە حیکایەت و
لە ئەفسانە و لە قەسیدەی سپی
پڕاوپڕ /
لە کۆچ و لە دابڕان و لە مردنی سپی ...!

دیسەمبەری ٢٠١٤

# ژنە چاوڕەشە نیگا سپییەکە

ژنێک لەبەر پەنجەرەوە
دەیەوێ
لە ڕۆشنایی شەوەکان و
لە سەوزایی باخچەکان و
لە دار سنەوبەرەکانی عەشق بڕوانێ
دەیەوێ
هەر لەبەر پەنجەرەوە
لە هەموو جوانییەکانی ژیان بڕوانێ
بە نێو
ڕێگا دوور دوورەکانی خەیاڵ بڕوا

هەر لەوێدا خەون ببینێ
هەر لەوێشدا تا ئەبەد بمێنێتەوە
ژنێکی چاورەشی نیگا سپی
لەبەر پەنجەرەیەک لە چاوەڕوانیدا
کڵۆ بەفرەکان و
گەڵا وەریوەکان و
وردە ئەستێرەکانی ئومێد دەژمێرێ
ژنێک لە ڕەنگی باران
بە دەم شانەکردنی قژی خۆرەتاوەوە
لە چاوەڕوانیدا
حیکایەتە بەرئاگردانییەکان
بۆ گوڵ و پەپوولەکان دەگێڕێتەوە
یەسنینەکانی ڕۆحیش
بۆ فریشتە و
بۆ ژنە ڕاهیبەکان دەچڕێ

ژنێکی تەڕ
تەڕتر لە تاڤگەکان و ڕووبارەکان
لە بەر پەنجەرەیەک لە چاوەڕوانیدا
خۆی ڕووت دەکاتەوە
مەمکەکانی خۆی لە مانگ و
لە پەرەسێلکە تەنیاکان دەشارێتەوە
لە بەردەم پەنجەرەیەکی خۆڵەمێشی
بە نیگایەکی مۆنالیزایی
پێڵووی چاوەکانی ئارام نابنەوە
لە چاوەڕوانیدا
دوور دوور دەڕوانێ

ژنێکی نەوڕەسی
جوانتر لە دیمەنە نەسیمییەکانی سروشت
شۆخ و شەنگتر لە پەرییەکانی خودا

ئەو ژنەی ...
عەشق جۆرە شەڕابێکە بۆ مەستی چاوەکانی
شیعر جۆرە سەمفۆنیایەکە بۆ خاوبوونەوەی دەمارەکانی
ژنێکی / خەیاڵ سپی و خەندە سپی
خۆزگە سپی و خەون سپی
ژنێکی / سپی سپی سپی
ژنێک /
لە من مەستتر و بزێوتر
لە من خەمۆکیتر و یاخییتر
لە من ئاویتر و بارانییتر
لە من تەڕتر و شەونمیتر
لە من نەرمتر و پڕ نیگاتر
لە من گەشتر و گوڵنارییتر.
لە من ئیرۆسیتر و ئاگرییتر

لە من نوورانیتر و خوداییتر
لە من دێوانەتر و عاشقیتر ...
ژنێک /
چەندین ساڵە وەک سێبەری درەختێک
لەبەر پەنجەرەیەک لە چاوەڕوانیدا
وڕێنەکانی با و گۆرانییەکانی گەردەلوول و
خەونە خوناوییەکانی خاڵخاڵۆکەیەک دەنووسێتەوە
من و ئەو ژنە
لە نێو تەمە سپییەکان و ڕەشەباکانی خەیاڵ
بۆ یەکەمینجار یەکترماننناسی
لە نێو نیشتیمانی شیعر بەیەکتر ئاشنا بووین
لە نێو خەڵوەتگەکانی نائومێدی یەکترمان خۆشویست
لە نێو ژوورەکانی تەنیایی ئاوێزانی یەکتری بووین

لە نێو عەشقێکی وەهمیشدا
لە نێو یەکتری تواینەوە
بووین بە هەڵم و تێکەڵ بە با بووینەوە

**دیسەمبەری ٢٠١٤**

# ترس

بەیاتریسە وردیلەکەم
لەوە دەترسم
کە زێتر لێم نزیک ببییەوە
تۆش وەک ئەوانیدی
سبەینێ لێم دووربکەوییەوە
چونکە من زۆر جاران
بە ئاگری نێو دۆزەخی دابڕان
پەنجەکانم سووتاون
بۆیە من دەمەوێت
ئەمجارەیان
لە نێوماڵی شیعرەکانم زیندانیت بکەم

لەنێو باخچەی خەیاڵەکانم لە خاچت بدەم
لە نێو خەڵوەتگەی خەونەکانیشم
تا ئەبەد بتهێڵمەوە
جارێکی تر
خۆم نەدەمە دەست
شەپۆلە سەرشێتەکانی هەرزەییم
من دەمەوێت ئەمجارەیان
دوا ڕەشماڵی ئەم عەشقەی خۆم
لە هەواری بنار مەمکۆڵەکانی تۆ دابنێم
ئیتر تا ئەبەد نەڕۆمەوە

**نۆڤەمبەری ٢٠١٤**

# لەخۆبایی

( فریشتەیەک لە تابلۆیەکی ئەپستراکت دەچێ
یان هەندێجار وا دەردەکەوێت کە
تێکەڵاوییەک بێت لە ڕەنگەکانی عەبەسییەت و وجودییەت ،
بەڵام جەخار ...
نامە و کتێبەکانی عەشق ناخوێنێتەوە
خاچەکەی مەسیحی بە شانی خۆیداداوە و
تەنها دەیەوێت لە خوداوەند نزیک بێتەوە ...! )
گوێبگرە ئەی لەخۆبایی
دەزانم تۆ کاتی ئەوەت نییە
لەبەردەم ئاوێنە بوەستیت
لێوە ناسکەکانت سوور کەیتەوە

یان لە ژێر باران
درەختەکانی ڕۆح و نیگا هەنارییەکانت
تەڕکەیتەوە
دەزانم تۆ کاتی ئەوەت نییە
لە زەردەخەنەی ماسییەکان
لە سەمای سمۆرەکان بڕوانی
یان گوێ لە سەمفۆنیای ئاو ڕابگریت
وردە شیعرێکی ئیرۆتیک بخوێنیتەوە
دەزانم ئەی فریشتە ڕەشتاڵەکە
تۆ کاتی ئەوەت نییە
پەنجەکانت ئاشنا کەیت
بە جەستە و مەمکۆڵە لیمۆییەکانی خۆت
خۆرەتاو ئاشنا کەیت

بە ژوورە تاریکەکانی دڵی خۆت
خەیاڵەکانت ئاشنا کەیت
بە بوخچەی ئارەزووە ئاوییەکانی خۆت
دەزانم تۆ کاتت نییە
بۆ خوێندنەوەی
ئایەتەکانی ڕەشەبا و
حیکایەتەکانی شەونم
یان لەگەڵ پیاوە سپییەکانی بەهەشت
پیاسەیەک بە نێو باخچەکاندا بکەی
دەزانم تۆ کاتی ئەوەت نییە
بیر لە مردن و بیر لە هیچ شتیک بکەیتەوە
چ جای نامە و خەونە تورەهاتییەکانی من ...!

**بەفرانباری ٢٠١٥**

# با بڕۆین بۆ کۆبانێ

١

ئێستا کۆبانێ پەرستگەیە
چاومان پڕ دەکات لە ڕووناکی
گوڵدانێکە پڕ لە بخوور
ڕۆحمان پڕ دەکات لە بۆنی خاک
ئێستا کۆبانێ جەستەیەکە لە ئاگر
پەیامە ڕەشەکانی چەرخی بەردین دەسووتێنێ
لە مەودوا خۆری ئازادی و سەرفرازی کورد
لە ئاسمانە شینەکەی کۆبانێ وە هەڵدێ
خودایە ئەم فیردەوسی عەشق و بەرخودانییە
با هەر گەشاوە و ئاوەدان بێ
دەی هاوڕێیان / با بڕۆین بۆ کۆبانێ

٢

ئێستا کۆبانێ تریفەی مانگە
لە نێو شەوی
هەموو کیشوەرەکانی دنیا دەدرەوشێتەوە
لاوکێکی خەمناکە
حیکایەتی قەومێکی مەزلومی بێ وڵات دەگێڕێتەوە
سروودێکی بروسکەییە
بە ڕێنووسە شینەکانی عەشق دەنووسرێتەوە
خودایە ئەستێرەکانی هیوای
نێو خەونەکانی کچان و ژنە شەڕڤانەکانی کورد
با هەر گەشاوە و پرشنگدار بێ
دەی هاوڕێیان / با بڕۆین بۆ کۆبانێ

٣

وەرە ئەی شۆخ
با کۆبانێ ئاوەدان بکەینەوە و
ناوی بنێین ( شاری خۆشەویستی )
شەقام و گۆڕەپان و باخچەکانی
بکەینە شوێنی پیاسە و
شوێنی سەماکردن و ئەڤین
یان بیکەین بە شوێنی خەون بینین
وەرە گوڵم / با لەوێدا
لە جیاتی جامانە و جلە خاکییەکان
جلی سپی بووکێنیت بکەمەبەر
لە جیاتی چەک و فیشەک
توورەگەیەک نان و

سەبەتەیەک گوڵ و کتێبەکانی عەشق
بەسەر ماڵەکان و پەرستگەکان و
بەسەر قوتابخانەکان و
بەسەر مزگەوت و کەنێسەکان دابەش بکەین
دەوەرە دەی / با بڕۆین بۆ کۆبانێ

**بەفرانباری ٢٠١٥**

# لە ئەنفالەوە تا عەشق

١

پەیکەرێک لە ئێسک
پەیکەرێک لە خۆڵ
پەیکەرێک لە چاو
پەیکەرێک لە بیابان
پەیکەرێک لە تابووت
من ناوی دەنێم ئەنفال

٢

پەیکەرێک لە چەقۆ
پەیکەرێک لە مەمک
پەیکەرێک لە قژ

پەیکەرێک لە عەشق
پەیکەرێک لە نان
من ناوی دەنێم ژن

٣

پەیکەرێک لە خاک
پەیکەرێک لە خوێن
پەیکەرێک لە خۆڵەمێش
پەیکەرێک لە خەزان
پەیکەرێک لە خوناو
من ناوی دەنێم نیشتیمان

٤

پەیکەرێک لە وشە
پەیکەرێک لە خەیاڵ

پەیکەرێک لە ڕووبار
پەیکەرێک لە جوانی
پەیکەرێک لە هاوار
من ناوی دەنێم شێرکۆ بێکەس

٥

پەیکەرێک لە با
پەیکەرێک لە باران
پەیکەرێک لە بێهوودەیی
پەیکەرێک لە بەفر
پەیکەرێک لە هیوا
من ناوی دەنێم مرۆڤ

٦

پەیکەرێک لە چاوەڕوانی
پەیکەرێک لە نائومێدی
پەیکەرێک لە ڕەنگ
پەیکەرێک لە مردن
پەیکەرێک سۆز
من ناوی دەنێم غوربەت

٧

پەیکەرێک لە تەنیایی
پەیکەرێک لە خۆر
پەیکەرێک لە ئاو
پەیکەرێک لە ونبوون
پەیکەرێک لە خەون
من ناوی دەنێم عەشق

نۆڤەمبەری ٢٠١٤

# من گۆرانی بۆ ژیان دەڵێم

دڵم قوتویەکی بەتاڵە
لەسەر گوفەکێکی یەکێک لە گەرەکە میللییەکان فڕێدراوە
ڕۆحم کۆڵارەیەکی کاغەزینە
بەدارتەلێکی کارەبا گیربووە و لێنابێتەوە
جار جار پەنجەکانم
جار جار پەراسووەکانم
جار جارەش چاوەکانم
یاخی دەبن لێم جیادەبنەوە
جەستەم وەک دارسنەوبەرێکی رووت
لەبەر باران هەڵدەلەرزێ
لەوەتەی هەم
لەسەر پەتی مەرگ بازبازێنمە و

نازانم چۆن گەیشتوومەتە ئێرە
بەڵام ئەوە باشدەزانم
لەوەتەی هاتوومەتە بوون
وەک تاڤگەیەکی بێهوودە
بەردەوام
گۆرانی بۆ فڕینەکانی ژیان و
بۆ سەرکەشییەکانی مرۆڤ و
بۆ تریفەکانی ئازادی و
بۆ سەمفۆنیای گولەگەنم و
بۆ ڕەهابوونی عەشق دەڵێمەوە

**بەفرانباری ٢٠١٥**

# تارمایی

ژنێک لە بنەچەی باران
پەیکەرێک لە جوانی
نیگارێک لە وشە
تاڤگەیەک لە ترپفە
ئۆقیانووسێک لە ئاو
مەرکانێک لە میهر
سەبەتەیەک لە سۆز
ژنێکی میهرەبان
وەک فرمێسکە بێگەردەکانی مۆم
وەک دوکەڵە سپییەکانی بخوور

ژنێک لە نێو ڕووناکییەکانی تەنیایی
چاوڕەشی نیگا سپی
لە نێو تاریکییەکانی شەو
پەرچەم شینی خەیاڵ پەمەیی
عەشق لەگەڵ تارمایی پیاوێکدا دەکات
هەر بەخەیاڵ لە دووری دوورەوە
بۆ چاوە ماندووەکانی مانگ
بۆ ئەستێرە و هەورە سپییەکان
خۆی ڕووت دەکاتەوە
بە گەڵا خۆڵەمێشییەکانی عەشق
خۆی دادەپۆشێ
جار جارەش لە نامەیەکدا بۆی دەنووسێ
( ببوورە ناتوانم لچکە کراسی عەشق بخەمە سەر
هەموو ڕۆژێک نوێژی بۆ بکەم و
کڕنووشی بۆ ببەم

بە پێی بازنەی خۆرەتاویش بسووڕیمەوە )

ژنێکی یاخی
یاخیتر لە بەفر و با
ڕەنگاڵە و ڕەنگین
دەمێک سپی
دەمێک ڕەش و
دەمێکیش شین
عەشق لە لای ئەو مرۆڤە
درەختێکە لە تارمایی
ژیان لەلای ئەم مرۆڤە
حیکایەتێکە لە وەهم
ئەو ژنە لە نێو ڕۆحی شەودایە
تەنها لە تاریکیدا دەردەکەوێ
تەنها لە نێو خەونەکاندا .

بەچاوی خەیاڵ دەبیندرێ
لە نێو بادا دەسووڕێتەوە
ئەم ژنە /
شاعیرێکی ڕۆژهەڵاتی دەکا بە درەختێکی تارمایی و
خۆشی دەوێ
بە پیاوە سپییەکەی ناو کتێبان ناوی دەبا
لە نێو خەڵوەتگە وەهمییەکان
بە دیار جەستە ڕووتەکەی خۆی
بە وشە ئیرۆسییەکان بە سەمای دەهێنێ
ڕۆژەکان و
شەوەکانیش
لەنێو تریفەی کتێبەکانی دەخەوێ
ئەم ژنە سەرکەشە
لە ژیان یاخی بووە

لە عەشق یاخی بووە
لە پەنجەکان و دەستەکانی پیاو یاخی بووە
وەکو ئاگر
لە ئاوەدانی و لە هەمووشتێک یاخی بووە
بەس لە شیعر نا
ئەو ژنە تەنها و تەنها
لە نێو کێڵگەکانی با
لە نێو هەوارگەکانی هەور
لەژێر خیوەتەکانی خەیاڵ
بوخچەی ئارەزووە ئیرۆسییەکانی
دەکاتەوە و بەدوای
ختووکە ئۆخەییەکانی خەوندا دەگەڕێ
بۆ گەیشتن بە ترۆپکی ئارەزووەکان

جەستەی دەبێتە چەند دڵۆپە بارانێ
تێکەڵ بە ڕۆحی خاک دەبێتەوە
ئەم گوڵە ڕەشتاڵە شەبەنگە شەوینییە
تاراوگەیەکە لە تەنیایی
تەمتومانێکە لە تاریکی
پەیکەرێکە لە تارمایی ...!

**دیسەمبەری ٢٠١٤**

# لە نێو خۆمدا بەدوای تۆدا دەگەڕێم

هاتم بەدوات
بێزار بووم لە خەونە بێرەنگەکانی خۆم
بێزار بووم لە هەڵوەرینی گەڵاکان
لە سروودەکانی رەشەبا
لە سەمفۆنیا سواوەکانی سروشت
لە سەفەرە سەرابییەکانی ونبوون
لە ڕووتبوونەوەی شەونم
لە گەمە دۆڕاوەکانی عەشق
لە گۆرانییە دووبارەییەکانی بەفر
لە وەهمە بێرەنگەکانی گەردەلوول
لە وەرزە مردووەکانی تەنیایی
هاتم بە دوات

بەنێو کۆڵانە تاریکەکانی خۆرەتاو و
بە نێو ڕووبارە شەڕابییەکانی دڵی ئەستێرە و
بە نێو شەقامە شەختەییەکانی نێو مەمکۆڵەکانی مانگ دا گەڕام
هاتم بەدوات
بێزاربووم لە مەودا دوورەکانی نێوان خۆم و ژیان
لە پەرێزە سووتاوەکانی نێوان خۆم و عەشق
لە بیابانە دڕکاوییەکانی نێوان خۆم و فریشتەکان
هێندە بەدواتدا گەڕام
تا خۆم و
هەموو خەون و پەمەییەکانیشم ونکرد
ئێستا لە بۆشاییدا دەسووڕێمەوە
لە خۆم و لە زەمەن دوور کەوتوومەتەوە
دەمەوێت بگەڕێمەوە سەر زەوی
لە نێو مەملەکەتی شیعر
خۆم لە نێو تۆ

تۆ لە نێو خۆم دا ببینمەوە
دەمەوێت گەڕانەکانم بەدوای تۆ دەستپێبکەمەوە
هاتم بەدوات
لە نێو خۆمدا بەدوای تۆدا دەگەڕام
چونکە من دەتوانم
لەخۆم دوور کەومەوە بەس لە تۆ نا
وەکچۆن دەتوانم
بە بێ خۆرەتاو بژیم بەڵام بێ خەون نا
یان بە بێ عەشق بژیم بەڵام بێ شیعر نا
من هەمیشە بە دوای تۆدا دەگەڕێم
وەکچۆن /
لە نێو خەونەکانم دا خەون دەبینم
لە نێو گەڕانەکانم دا دەگەڕێم
لە نێو سەفەرەکانم دا سەفەر دەکەم
بەدوای تۆ

هەموو دوورگەکانی نێو خۆم و خەونەکانم گەڕام
بینیم / هەموو شتەکان
بە ئاراستەی پێچەوانە ڕێدەکەن تەنها مردن و ژیان نەبێ
بینیم / هەموو کەسەکان
هاوتەریبانە ڕێدەکەن تەنها من و تۆ نەبێ
خۆم لە نێو ڕەشەبادا بینییەوە
تۆش لە نێو نیشتیمانی تەمەسپییەکان گۆرانیت دەگوت
لەگەڵ باڵندە شینەکان بە تەنیشتم دا ڕەتبووی
منیش / هەر دەگەڕام و دەگەڕام و دەگەڕام
لە نێو خۆمدا بەدوای تۆدا
لە نێو تۆش دا /
بەدوای خۆرەتاوە سەوزەکەی عەشق ...!

**نیسانی ۲۰۱٥**

# دزەکان

دزەکان دەتوانن ئاراستەی با و
سروودەکانی گەردەلوول و گۆرانییەکانی ڕووبار بگۆڕن
دەتوانن ڕەنگەکانی پەلکەزێڕینە و لەنجەکانی باران و
دیزایینی درەختەکان و ئایندەی سروشت بگۆڕن
دەتوانن بەسەر بازگەکاندا بازبدەن و سنوورەکان ببڕن
دزەکان لە ئاگر نزیک و لە خۆرەتاو دوور
لە ژیان نزیک و لە عەشق دوور
دزەکان لە بەهەشتەکان لەگەڵ حۆرییەکان دەخەون
لە تیاترۆخانەکان لەگەڵ لەشفرۆشەکان سەما دەکەن
لە نێو کۆشکەکانیش لەگەڵ شاژنەکانییان
زەردەخەنە و ماچ و پێکەکانییان دەگۆڕنەوە

دزەکان نارۆن بۆ دۆزەخ لە ئێمە سەروەرترن
ئەبەدییەت ماڵی ئەوانە و لە مردن بەهێزترن
مرۆڤی لە ئێمە چێترن دزەکان

دزەکان لەسەر ئەستێرەکانن
لەسەر شەقامەکان و
لەسەر کورسییەکان و
لەسەر سەکۆ و شانۆکانن
دزەکان لە نێو کۆشکەکانن
لە نێو باڵەخانەکان و
لە نێو پەرستگە و بەهەشتەکان و
لە نێو کتێب و ئەفسانەکانن
لە هەموو شوێنێکن دزەکان

دزەکان لە نێو بەیانییەکانن
لە نێو شەوەکان و
لە نێو ڕۆژەکان و هەفتەکان و مانگەکان و
لە نێو ساڵەکان و سەدەکان و
لە نێو وەرزەکانن
لە نێو هەموو زەمەن و کاتێکن دزەکان

دزەکان بە جلی سپییەوە
دەچن بۆماڵی خودا
بە دەوری بەردە ڕەشەکانەوە دەسووڕێنەوە
یان لەسەر کورسی شاهانەوە
بە جلی ڕەشەوە
لە نێو کەژاوە سپییەکانەوە
بە دەوری بوخچەی شەهوەتەکانییان و

بە دەوری خەونەکانیان دەسوورێنەوە
دزەکان جلی ڕەنگاوڕەنگ دەپۆشن
چاویلکەی ڕەنگاوڕەنگ دەکەنە چاو
تەزبێحی ڕەنگاوڕەنگ بادەدەن
دزەکان لەنێوِ ئاونە ئاڵتوونییەکان
باڵە وشکهەڵاتووەکانی پەپوولەکان و
گەڵا وەریوەکانی ئومێدەکان و
تووتنە بۆندارەکانییان بەیەکەوە دەکوتن
توند توند دەیانکوتن
گوڵە ڕەنگاوڕەنگەکانییان بە خوێن ئاودەدەن
بە قەڵەمەکانیش ئاگردانەکانییان گەش دەکەنەوە
ماڵ و ڤێلاکانییان گەرم ڕادەگرن
لە ئێمە ناسکتر و لە جنسی فریشتەکانن دزەکان

دزەکان سوپایەک لە جەلادییان هەیە
سوپایەک لە دەرگەوان و
سوپایەک لە نووسەر و لە زانا و دانا
سوپایەک لە شێخ و مەلا و کوێخا و گەدا
سوپایەک لە فەلەکناس و دەروونناس و ڕێگاناس
دزەکان کتێب ناخوێننەوە و
گوێ لە حیکمەتە ساویلکەییەکانی فەلسەفە و
قسە قۆڕەکانی مەعریفە ڕاناگرن
لەگەڵ ئەوەش جارجارە
سەیری فیلمە زایەندییەکان و فیلمە پڕ ئاکشن و کاوبۆییەکان دەکەن
یان گوێ لە حیکایەت و ئەفسانەی پیاوە مەزنەکان ڕادەگرن
لە ئێمە دانا و پڕ مەعریفەترن و دزەکان

( ئەستێرەی سەر گومبەزی دزەکان )

هەڵسە لە خەو ئەی سەرۆک
بەیانیت باش ئەی سەرۆک
هەموو کاتێکت باش ئەی سەرۆک
هەڵسە لە خەو و توند توند
توند توند توند
توند توند توند توند توند
دەست بە تفەنگەکەت و
دەست بە کورسییەکەت و
دەست بە کلیلی خەزێنەکەتەوە بگرە / ئەی سەرۆک

ئایاری ۲۰۱۵

# خەونە چاو بەخوماربییەکانی ئومێد

-خەون
ئەستێرەیەکی نێر مەمکەکانی خۆی
خستۆتە نێو دەمی هەورەوە
مانگیش جلەکانی داکەندووە
بە دەم چاوەڕوانی پایزێکی سەوز
خەو دەیباتەوە
منیش بۆ مژینی لێوەکانی گوڵەباغێکی جوانکیلە
پەڕ پەڕی تەمەنی غوربەتم هەڵدەدەمەوە
بە نیگاکانی خۆرەتاویش
خەونەکانم دەخوێنمەوە

- **چاو بەخومار**

من کە تۆم لە گەڵدا نەبێ
مردن بە دوامدا دەگەڕێ
شالوورە شینە شادومانییەکان
غەمگینانە دەخوێنن لە شەودا
وەرزەکان ون دەبن لە نێو زەمەندا
بارانی عەشقیش دڵۆپ دڵۆپ
فرمێسکەکانی دێنە خوار
تۆ نیشتیمانێک لە ئاگری / ئەی چاو بەخومار ...!

**- ئومێد**
گوڵەباغێک
لە نێو گوڵدانی گوڵەکانی باغ
گەش گەش دەگەشێتەوە
شوێنەکان و شەقامەکانی شەوانم
ڕووناک دەکاتەوە
لە نێو خەونە حەسرەتییەکانیشم
مەست مەست دەمتوێنێتەوە

**تەموزی ٢٠١٥**

# فۆڕمی ( گەڕان )

- مانیفێستۆکەیەک یان ئامانجمان لە فۆرمی ( گەڕان )
سەرەتا فۆرمی ( گەڕان ) فۆرمێکی نوێیە بۆ شیعر نووسین ، ئامانجمان لە داهێنانی ئەم فۆرمە ئەوەیە ،
١/ گەڕان بە دوای ناونیشان دا ، واتە گەڕان بەدوای ( شوناس ) دا ، چ لە ئاستی تاک یان لە ئاستی کۆ ، واتە ( کۆمەڵگە ) .
٢/ بەشداریکردنی کارای خوێنەر لە بەرهەمهێنان یان تەواوکردنی دەق ، بە دانانی ( ناونیشان ) واتە ، ئاوێزانبوونی خوێنەر لە ڕووبەرە شاراوەکان و تاریکەکانی دەق .
٣/ بەرینترکردن و فراوانکردنی دەسەڵاتی خوێنەر .
٤/ دەرکەوتنی خوێنەر وەک بوونێکی ( ئازاد ) ، هاوکات لەبەردەم هەڵبژاردنی چەند ئۆپشنێک .
٥/ ئیشکردن لەسەر گومان و ڕەتکردنەوەی بوونە ڕەها و جێگیرەکان ، واتە هەڵوەشاندنەوە و دووبارە بونیادنانەوەی دەستەواژەکان و چەمکە میتافیزیکی و جێگیر و چەسپاوەکان .

## گەڕان / ۱

( دایک ، مەستبوون ، عەشق ، وەهم ، شەهید ، مانگ ، سێکس ، ئیرەیی ، ژووان ، نیشتیمان ، بێهوودەیی ، دڵبەر ، تەیراوە ، پایز ، خەون ، نیگەرانی ، هیوا ، ئاڵا ، ژن ، سەفەر ، کوردستان ، وەرزەکان ، ونبوون ... )

### ١

( ..... )
ژنێک چاوێکی پڕە لە ڕووناکی
چاوەکەی تری پڕ لە دوکەڵ
مەمکێکی لە ئاگرە
مەمکەکەی تری لە بەفر
دەستێکی بە لچکەکراسی واقیع گرتووە
ئەویتری بە خەیاڵ
بە بێدەنگیش
ئایەتەکانی عەشق دەنووسێتەوە

## ٢

( ..... )
بە تخوبی هەموو زەمەنەکان ڕەت دەبێ
لە نێو ڕەنگی هەموو وەرزەکان دایە
لەگەڵ ئاو هەناسە دەدات
لە نێو تریفەی مانگ دەمێنێتەوە

## ٣

( ..... )
کتێبێکە پیتەکانی
ڕەشەبا دەینووسێتەوە

## ٤

( ..... )
چاوەکانی سەوز سەوز
مەمکەکانی سپی سپی
دڵی سوور سوور
خۆرەتاوێکی پرشنگیش لە نێویاندا دەدرەوشێتەوە
ئەم تابلۆیە ڕەنگینە لە هەر کوییەک ببینم
سڵاوێکی شاعیرانەی لێدەکەم

٥

( ..... )
ئۆقیانووسێکە پڕ لە شەپۆل
باخچەیەکە پڕ لە گوڵ
تاڤگەیەک پڕ لە هاوار

٦

( ..... )
پەیکەرێکە لە ئاگر

٧

( ..... )
کاتەکان بە خێرایی ڕەتدەبن
مەمکۆڵەکان و چاوەکان
تێکەڵ بە تاریکایی و
چرپەکانیش لە نێو بێدەنگیدا سەما دەکەن

٨

( ..... )
شێوە و ڕوخساری
لە کتێبە ئاسمانییەکان دەچێ
هەمیشە دەبێ بیخوێنمەوە

٩

( ..... )
کیشوەرێک لە میهر و
نیشتیمانێک لە سۆز و
پەرستگەیەک لە ڕووناکی

١٠

( ..... )
فڕینە بە نێو هەورە سپییەکانی خەیاڵ و
بە نێو ڕەنگە ناسکەکانی ئارەزوو
بە نێو ئەستێرەکانی خەون

## ١١

( ..... )
گۆرانی بۆ تەنیایی دەڵێ
بە زمانی بێدەنگی قسە دەکا
هەمیشە
لە مرۆڤە عاشقەکان و
لە خوداوەند نزیک دەبێتەوە

## ١٢

( ..... )
تابلۆی نائومێدییەکان ڕەنگ دەکاتەوە
بەردەوام لە نێو
زەردەخەنە ڕەنگ زێڕینییەکانی خۆی
ژیان بە جۆرێکی تر دەنووسێتەوە

## ١٣

( ..... )
هێندە بە دیار ئاوێنەکە مەوەستە
نەبادا پیاوەکانی نێو ئاوێنەکە
لێت ورد ببنەوە
وەکو من تێکەڵ بە نیگاکانت بن
هێندەش مەڕۆ بۆ دەم ڕووبارەکە
با ماسییەکانیش
مەست و حەیرانت نەبن

## ١٤

( ..... )
دەمگەیەنێتە لوتکەی بەختەوەری
پڕم دەکات لە سەوزایی
تەڕم دەکاتەوە وەک باران

## ١٥

( ..... )

ماڵێک وەک دڵی تۆ ئارام

وەک فیردەوس ڕەنگین

وەک سێبەر سپی

ئەگەر مردم بمگەڕێننەوە بۆ ئەو ماڵەم

هەر لەوێشدا بمنێژن

تێبینی / خوێنەری خۆشەویست ناونیشانی ئەم وردە شیعرانە لەو وشانەی سەرەوە هەڵبژێرن ، هەندێکیان زێتر لە ناوێک لەخۆدەگرن . خۆتان ئازاد و سەرپشک بن لە دانانی ناونیشانەکان ...!

**گەڕان / ٢**

( وەرزەکان ، هیوا ، تەنیایی ، عاشق ، جەنگ ، کتێب ، گەڕان ، یاخیبوون ، موسافیر ، مردن ، دابڕان )

١

( ..... )

لە ژێر ڕەشماڵی ئاگر ڕادەکشێت و
لە نێو مەمکۆڵەکانی بەفر سەما دەکا
خەون دەکات بە نیشتیمانی خۆی
ئەفسانە ئیرۆسییەکان دەخوێنێتەوە

بە زمانی گوڵ قسە دەکات و
مانگ و باڵندە تەنیاکانیش دەلاوێنیتەوە

٢

( ..... )

لە نێو خۆیدا
مەودای نێوان
ژیان و لە دایکبوونەوە
نزیکتر دەکاتەوە
مەودای نێوان ژیان و مردنیش دوور
ڕووناکی دەکات بە نیشتیمانی خۆی
خۆرەتاو بە نێو کۆڵانە تاریکەکاندا دەگێڕێ

٣

( ..... )
بەسەر شەپۆلەکان بازدەدات و
ئاوڕ لە دەریاکان ناداتەوە
ڕەشەبا دەکات بە نیشتیمانی خۆی
بۆ ئەستێرە بەرزەکان ناچەمێتەوە
بە زمانی زریان قسە دەکات و
فرمێسکەکانی نائومێدی دەسڕێتەوە

٤

( ..... )
عەشق لەگەڵ باراندا دەکەن
پەیکەرەکانی کات نوێ دەکەنەوە
ڕەنگەکان د:کەن بە نیشتیمانی خۆیان
مانایەک بە خاک و عەشق دەبەخشن

٥

( ..... )
ڕێگە باریکەکانی تاریکی دەگرێتە بەر
لە نێو کۆڵانەکانی با دەگیرسێتەوە
کەناری دەریاکان دەکات بە نیشتیمانی خۆی
ئایەتەکانی ئومێدیش لە بۆشاییدا دەنووسێتەوە

٦

( ..... )
هەموو دەرگا و پەنجەرەکان
بە ڕووی ژیان دا دەخات
مەرگ دەکات بە نیشتیمانی خۆی
ژیان دەکات بە زیندانێکی تاریک

٧

( ..... )
گوڵەباغێک
لەنێو قووڵایی تەنیاییدا
ئاگر لە سێبەری خۆی بەردەدا
دۆزەخ دەکا بە نیشیمانی خۆی
بە پارچە خەڵووزێکی ڕەش
لە سەر دیوارە سپییەکانی خەون
بیرەوەرییەکانی خۆی دەنووسێتەوە

## گەڕان / ٣

( عەشق ، شێتبوون ، خەون ، دووبارەبوونەوە ، گومان )

١

( ..... )

لەوەتەی هەین

هەمان شەو هەمان ماچ

هەمان هەتاو هەمان باران

هەمان ونبوون هەمان خەزان

هەمان سەفەر هەمان گەڕان

هەمان و هەمان و هەمان

هەمان مردن و هەمان ژیان ...!

## ٢

( .... )

کاتێک بە یەکەوە قسەمان دەکرد

هەستم بەوە دەکرد

باران هێواشتر دەبارێ

درەختەکان سەیرمان دەکەن

بەردەکان گوێیان ڕاگرتووە

مرۆڤەکانیش سەیر و نائارام دەهاتنە بەرچاو

نزیکتر بەرەوەلێم

قسەم بۆ بکە / هێواشتر بە چرپەتر

من باوەڕم بە سێبەری خۆشم نییە

چ جای باران و

درەختەکان و بەردەکان و مرۆڤەکانییتر ...!

٣

( ..... )
پیاوێکی ڕەشتاڵەی قژ سپی
لەگەڵ ژنێکی پێست سپی چاوڕەش
عاشقی یەکتری دەبن
بەیەکەوە
هەموو ڕێگا هەوراز و نشێوەکان دەبڕن
هەر بەیەکەوەش سەردەنێنەوە
دواتر لە نێو
کتێبێکی نێو دەلاقەی ژوورەکەیان
پارچەکاغەزێک دەدۆزنەوە
لێی نووسرابوو
( ئای خۆزگە
ژیان بۆ تاهەتایە
بەردەوام دەبوو ...! )

**گەڕان / ٤**
( تەنیایی ، خۆزگە ، چاوەڕوانی )

( ..... )
حەزدەکەم
پەنجەرەی ژوورەکەم هەر کراوە بێ
بەڵکو ئەوە خوایە
پەپوولەیەک دێتە ژوورەوە
گوڵی تەنیاییم بۆندەکات و
شێلەی خۆزگەکانیشم هەڵدەمژێ

**دیسەمبەری ٢٠١٥**

# ( کۆلانە زەردەکە )

من لە منداڵییەوە بەو کۆڵانە ئاشنام
کۆڵانێکی زەرد پڕ لە گەڵا
کۆڵانێکی هێمن پڕ لە نائومێدی
کۆڵانێک پڕ لە مرۆڤی تەنیا
هەموو ژێر درەختێک و پەنا و قوژبنێکی ئەم کۆڵانە
بۆنی ڕەشەڕەیحانەی نێو خەیاڵەکانی منیان لێدێ
من و شیعر و خەونەکانم
ڕەنگی ئەم کۆڵانەمان گرتووە
من کە بەم کۆڵانەدا ڕەتدەبم
وا هەست دەکەم

لە شەقامەکانی بەهەشتەوە پیاسە دەکەم
ئارام ئارام وەک خەیاڵە ئەرخەوانییەکانی خودا
ئومێدەکان و
حەز و غەریزە ئیرۆسییەکانم تەڕتر دەبنەوە
وەک ڕێواسە ناسکەکانی بنار زورگەکان و قەدپاڵەکانی چیا
ڕۆمانە بەرگ سپییەکەی منداڵیم
بە تاسەتر و ناسکتر دەبێ
بە گێڕانەوەی حیکایەتەکانی
شەکرۆکە ترش و شیرنەکانی
( پلکە حەنیفی ) دوکاندار و
کەر و عارەبانەکەی
( مام قادری ) بەیتار و
یان / مەرگی ناوەختی ( نایف )
ئەم ڕۆژە گەرمانەی منداڵیم چەندە جوان بوون
ژیان تا بڵێی سادە و ساکار

بەڵام هەمووومان ئاسوودە و بەختەوەر
من کە بەم کۆڵانەدا ڕەتدەبم
وا هەست دەکەم میهرەبانترین مرۆڤ و
بەختەوەرترین عاشقم
بۆیە هەر بە ئومێدی ئەوەم ڕۆژێک دابێ
بگەڕێمەوە ئەو کۆڵانە و
لەوێدا /
ڕەشماڵێک هەڵبدەم
تا هەتا لە نێویدا بمێنمەوە
یان وا هەست دەکەم
من لەو کۆڵانەدا بەدوای کەسێک دا دەگەڕێم
کەسێک / لە خۆم غەمگینتر و تەنیاتر
کەسێکی چاوشین و خەیاڵشین
شینتر لە شینەکانی دەریا
شینتر لە شینەکانی هەور

شێنتر لە شینەکانی شیعر
وا هەستدەکەم هەر لەوێشدا دەیدۆزمەوە
چ سیحراوی و شەوەماوییە
جوانییەکانی ئەم کۆڵانە
چ تابلۆیەکی ڕەنگین و
چ پەیکەرێکی سوریالییە ئەم کۆڵانە
لە فیگەرە حەزینەکانی نێو خەونەکانم دەچێ
کۆڵانێکی مەست بە جوانییەکانی ئاو
کۆڵانێکی ئاوی بە مەسنەوونەکانی عەشق
درەخت و دەرگا و دیوارەکان .. ئاوی
جۆگەلە و جۆبرکە و رەنگەزۆرەکان .. ئاوی
کچۆڵەی کەویاری ئاوی
مێردمنداڵی منەوەری ئاوی
( بەرخۆنەی ) بێگوناهی ئاوی
قوشقافەزی قەشەنگی ئاوی

ئاو ئاو ئاو ئاو
چ دەبێ گەر هەموو شتەکانی ژیان
وەک ئەم کۆڵانە زەردە دەبوون بە ئاو
ئەستێرە و ئاسمان و دارستان و چیاکان
عاشقەکان و جێژووانەکان
پاشاکان و کۆشکەکان
ڕێبوارەکان و ڕێگاکان
هەژارەکان و کەڵاوەکان
خوداکان و پەرستگەکان
هەر هەموویان دەبوون بە ئاو
لە نێو ئەم کۆڵانە زەردە زێڕینییەدا
نەرم نەرم گەڵاکان دەوەرن
بێدەنگ بێدەنگ باران دەبارێ
وەرزەکانی تەمەنیش یەک بەدوای یەک تێدەپەڕن
ئەم کۆڵانەش تادێ ڕەنگ و ڕوخساری زەردتر دەبێ

تادێ ژیان لە نێو ئەم کۆڵانە بچووکتر و بچووکتر دەبێتەوە
تا دێ بوخچەی خۆزگەکانیش گرێکانیان توندتر دەبن
ڕەنگی تەیرە عەبابیلەکانیش کاڵتر دەبنەوە
ئێستا زەمەن لەنێو ئەم کۆڵانەدا خەون نابینێ
ئەستێرە و پەڕەسێلکە و درەختەکانیش
خەون نابینن
بە بیرم دێ ڕۆژانێک لەم کۆڵانە زەردەدا
کات خەونی دەبینی
مرۆڤەکان خەونییان دەبینی
تەنانەت زەردەواڵە و پەپوولە و مێشوولە و
هەموو زیندەوەرەکان خەونییان دەبینی
هەموومان پێکەوە لە نێو خەونێکی گەورەدا بووین
دەمەوێ بگەڕێمەوە ئەم کۆڵانە زەردە و
لەگەڵ کوڕ و کچانی منداڵیم
ژیان و گەمەکانم دەست پێبکەمەوە

شەوان ( قەرە قەرەیانێ ) و( چاوشارکانێ )
بە ڕۆژیش ( پەلیکانێ و ڕەسم ڕەسمانێ و کەلاَیانێ و
شێر و خەتانێ و ساپساپانێ و تۆپانێ و ... )
یان / لەگەڵ کۆلانانەکانی دەوروبەر
شەڕە بەردانێیەکانمان دەست پێبکەینەوە
با بگەڕێینەوە نێو ئەو ڕۆژە گەرمانەی
کە ئاگر لە نێو دڵی خاک هەڵدەستا
ئەو گەرمایەی کە سەری کەچەڵانی دەسووتاند
ئێمەش بە تەپە تەپی تۆپێن و بە هاتوهاوارەکانمان
هەموو دوای نیوەڕۆیەک
خەومان لە چاوەکانی ( مەلاژنە عەیشێ ) و
هەموو دراوسێکان دەتۆراند
یان دەمەوئێوارانی ئەم پێنجشەممانەی
کە مام ( سابیری مجێور )
لە گۆڕستانی ( شیخ مەلاڕەشید )

ئایەتە قورئانییەکانی بۆ خەڵکان دەخوێند
ئەوانیش دوای تەواو بوونی ئایەتەکان
نان و حەلوای بەشەکرییان بەسەرماندا دابەش دەکرد
ئاخ چەند شیرین و شەکەری بوو ئەم حەلوایە
دەبا بگەڕێینەوە
ڕۆژە هەرە سەرەتاییەکانی نێو
قوتابخانەی ( برایی )
وەکوجاران لە گۆڕەپانی قوتابخانە بەڕیز بوەستینەوە
گوێ لە قسە و وتارەکانی
مامۆستا ( سەرهەنگ تۆفیق ) ڕابگرینەوە
یان ( کامەران بێباک ) بە دەنگە زوڵاڵەکەی
شیعر و پەخشانە نەتەوەییەکانمان بۆ بخوێنێتەوە
دواتر بچینەوە نێو پۆلەکان
لە پۆلی یەکەمەوە تا پۆلی شەشەم بەسەریان بکەینەوە
لەگەڵ یەکبەیەکی مامۆستاکانیش دابنیشینەوە

( مامۆستا ئیحسان ، مامۆستا قاسم ، مامۆستا مەنسور ،
مامۆستا یەعقوب ، مامۆستا حسێن ، مامۆستا موحەمەد ،
مامۆستا هورمز ، مامۆستا عادل ، مامۆستا محسین ، مامۆستا یوسف ،
مامۆستا حەسەن ، .... )
یان مام ( مەدۆک ) ی فەراش
هەرگیز ئەم ڕۆژەشم بیرناچیتەوە
کە مامۆستا یوسفی وانەی کوردی
لە نووسینی داڕشتنێکدا
( سی لەسەر سی ) پێ بەخشی بووم
داڕشتنەکەش لەسەر جەژنی نەورۆز بوو
منی منداڵ /
سێ لاپەڕەم بە شیعر بۆ نووسی بوو
نیوەی دەرسەکەش بە ستایشی من و
بە ستایشکردنی داڕشتنەکەمی بەسەربرد
لە نێو ئەم ستایشەی مامۆستا یوسف

هەستم بە گەورەترین هێزی شیعر کرد لە خۆمدا
هەستم بە منێکی باڵا کرد
باڵا باڵا باڵا
یان ئەو منە باڵایەی
لە نێو قەسیدەی ( دەقی تەمەن ) و
لەنێو قەسیدەکانی ترم باسییان دەکەم و دەڵێم
( هەر خۆم و هەر خۆم و هەر خۆم
خۆمی تاک و تەنیا
خۆم تا ئەبەد خۆم ... )
هەستم بە تۆخترین ڕەنگە نەرجسییەکان کرد
هەر لەو ڕۆژە هەستم بە فڕینی خۆمکرد و
وامدەزانی من لە جنسی ئەستێرەکانم
یان لە جنسی گەردەلوول و بروسکەم
هەستم بەوە دەکرد پەنجەکانم
بۆ قەڵەم و بۆ شیعر دروست بوون

شەلاڵم کە لەنێو خۆتدا ئەی عەشق
من منداڵەکەی نێو کۆلانە زەردەکەم
بەشەوچڕینی شالوورە شینەکان شادومانم کە
لە نێو شەونمی سەر گۆنات هەڵم بگرە ئەی گەلا
بە بەرائەتی تەڕێتی خۆتم بسپێرە
بمگەیەنە نێو مەمکۆڵەکانی خۆرەتاو
یان نێو چاوەگەشەکانی گوڵەباغێکی نێو باغەکانی خودا
ئەی عەشق وەرە بمبەرەوە نێو کۆلانە زەردەکەی خۆشەویستی
بۆ نێو کۆلانە ئیرۆسییە ئاوریشمییەکانی خەون
با وەکجاران لەنێو کەژاوەی ڕاسانەکاندا
سێنییەک پاقلاوە و سێنییەک شەکەرات
سێنییەک گەزۆ لەوزینە و سێنییەک شروب
کارتۆنێکی فلینەی پڕ
لە چلوورە و کرێمستی و یازدەی ئازار
مەنجەڵێک شێلغەم و پاقڵەی کولاو

فەردەیەک فەریکە نۆک و ڕێواسی شلک و ناسک
قاپێک تەمەر هندی
بەسەر ئاپۆڕای خەڵکەکە و
بەسەر منداڵانی گەڕەک دابەشبکەین
با وەکجاران گوێ لە گۆرانی و بەستە خۆشەکانی
ژن و منداڵە کۆچەرییەکان بگرینەوە
دوای تەواوبوونیشییان
یەک دوو نانە تیری و چەند عانەیەکییان پێ دەبەخشین
با وەکجاران بە کۆمەڵ دەموچاوی خۆمان ڕەشبکەینەوە و
لە دەوری بووکە دارینەیەک کۆببینەوە
لەبەردەمی ماڵەکان
هەموو پێکەوە
ئەم گۆرانییە بڵێینەوە
( بووکە بە بارانێ
ئاوی بن دەغلانێ

هەیاران و مەیاران
یاخوا دەکاتە باران
بۆ فەقیر و هەژاران ... )
ئەوە چ ژینە عەشقێک و
ئەوە چ ژینە مردنێکە
ئەوە چ چارەنووسێکی زەردە ئەی خودا ...؟
وەرە ئەی زەمەن
من ڕەتبووم و تۆ ڕەتمەبە
من وەکو خۆرەتاو ئاوابووم و تۆ ئاوامەبە
نیو سەدەیە بێوچان من ڕەتدەبم
وەک گەڵا من دەوەرێم و وەک گوڵ دەژاکێم
نیو سەدەیە بێوچان دەکەوم
هەندێجار ناتوانم هەڵسمەوە
نیو سەدەیە بێوچان ئاوادەبم
ناتوانم ئاوڕێک لە دواوەی خۆم بدەمەوە

نیو سەدەیە دەڕۆم و ناگەم بە هیچ
هەر لە بۆشاییدا دەسووڕێمەوە
بۆشایی و بۆشایی و بۆشایی
نیو سەدەیە بۆشایی ماڵ و نیشتیمانمە
نیو سەدەیە منداڵی و کۆڵانە زەردەکەم
لەگەڵ خۆمدا دەگێڕم
لە نێو خەونەکانم دا بە تارایەکی سپی دایاندەپۆشم
نیو سەدەیە زەردێتی منداڵیم
دەڕژێتە نێو خۆم و خەیاڵەکانم
هەناسە و سیبەکان و پەراسووەکانمی داپۆشیوە
شیعرەکانم و کتێبەکانم و وشەکانمی داپۆشیوە
من ئێستا مرۆڤێکی زەرد زەردم
ناخێکی سەوز و ڕوخسارێکی زەرد
خەونێکی سەوز و خەیاڵێکی زەرد
هیوایەکی سەوز و زەمەنێکی زەرد

من ئێستا بە زمانێکی زەرد قسە دەکەم
بە هەمان زمانیش شیعر دەنووسم
نازانم ئەو زمانەی من
زمانی نێو کتێبە زەردە ئاسمانییەکانە
یان /
زمانی نێو کتێبە سوورەکانی ئەستێرەیە
یان کتێبە سەوزەکانی باخچە
یان کتێبە خۆڵەمێشییەکانی خاک
من کێێێمممم ئەی خودا ؟
بەرەو کوێ دەڕۆم و دەمەوێ لە کوێ بگیرسێمەوە .
نیو سەدەیە بە شمشاڵێکی وەهمی
ئاوازێکی ناشاز دەژەنم
نێو سەدەیە / تورەگەیەک لە وەهم و
جانتایەک لە پرسیار و
بوخچەیەک لە گومان لە گەڵم دایە

نێو سەدەیە سێبەرێک لە نائومێدی بەدوامەوەیە
نیو سەدەیە لە نێو خەونەکانمدا
نەزیف دەبم و خوێنێکی ڕەش ڕەشم لەبەر دەڕوا
نیو سەدەیە لە ژیان ڕادەکەم و لە نیو مردندا دەژیم
لە ڕووناکی ڕادەکەم خۆم بەتاریکی دەسپێرم
هەر لە ئەزەلەوەش
لە ماڵێکی تاریک هاتوومەتە دنیا
تاریک تاریک تاریک
تاریک وەک ئەشکەوتە تاریکەکانی بەهەشت
تاریک وەک کونجە تاریکەکانی نێو تەمە سپییەکانی ئاسمان
تاریک وەک زیندانەکان و ژێرزەمینە تاریکەکانی
نێو مەملەکەتی خۆرەتاو
وەرە ئەی زەمەن
لە نێو ئامێزی زریانی خۆت هەڵم بگرە و
لوولمدە لە نێو گەڵای ئومێدەکانت

ڕەنگمکە / بە ڕەنگە کازێوەییەکانی دڵی خۆت
مبەرەوە نێو کۆڵانە زەردەکەم
بۆ ژێر دەوارەکانی موحیبەت و
بۆ نێو چیرۆکە /
گەرم گەرمەکانی خۆشەویستی
یان گۆرانییە بەسۆزەکانی ئاوەدانی
لە نێو ئەم کۆڵانە زەردەدا
بە دیوێکدا
ژیان بە دەوری ماڵی مەرگ دەسووڕایەوە
زەمەن وەرزەکانی خۆی نەدەناسییەوە
خۆرەتاو لەناو کونجێکی تاریک خۆی دەشاردەوە
خەونەکان بە بێهوودەیی دووبارە دەبوونەوە
ڕۆژەکان و مانگەکان و ساڵەکان ڕەتدەبوون
بە بێئەوەی نیگاکانییان لەگەڵ یەکدا بگۆڕنەوە
یان ترسی دائیرەی ئەمنەکان و

پیاوە سمێل فشەکانی بەعس
هەمیشە مەرگ وەک عەمودێک
لە سوچێکی کۆلانەکە چەقێندرابوو
ئێمەش بە دەوری دا دەسووڕاینەوە
یان ترسی لافاو
بەیانییەک لە خەو هەڵساین
بینیمان غەڵبە غەڵبە و گەڕەک شێواوە
کۆلانەکان غەرقی ئاو ببوون
بە چاوەکانی خۆم
بێشکەی منداڵان و مەنجەل و کەلوپەلی ترم بینی
لەگەڵ شەپۆلەکانی ئاو دەڕۆیشتن
لەولاوەش باس باسی مردن و خنکان بوو
دواتر پێیان گوتم
( عەلی حەمە شەریف ) لە ئاوەکەدا خنکابوو
منداڵێکی قژلوولی چاوگەش

عەلی هاوپۆل و هاوڕێی کۆڵانم بوو
ئای چ خەبەرێکی خەمناک و پڕ ئازار بوو ئەم مردنە
من لەو ڕۆژەوە لە لافاو و ئاو دەترسم
لە هەرکوێدا لافاو دەبینم
وێنەی منداڵێکی چاوگەشی قژلوول دێتەوە پێش چاو
بەم هەموو نائومێدییانەشەوە
هێشتا هەر فیردەوسێکی سەرزەمینە ئەم کۆڵانە
بە دیوەکەی تریش
ژیان بە ڕووتی وەک چارۆگەیەک بەسەر تەنافەکان هەڵواسرا بوو
عەشق بە ڕووتی خۆی لە قەدی درەختەکان ئاڵاندبوو
مانگ بە ڕووتی لە کەنار جۆگەکان ڕاکشابوو
زەردەخەنە بە ڕووتی
لەسەر دەرگاکان وێنەی خۆی ڕەسم دەکرد
بەرائەت لەگەڵ باراندا دەباری
حەوشە و بەردەرگەی ماڵەکانی پاکدەکردەوە

ئاو لە نێو مەستبوونەکانی خاک دەخەوت
با هەموومان پێکەوە بگەڕێینەوە بۆ ئەم کۆڵانە
دەی دەبا بڕۆین
با کەرنەڤاڵی عەشق لەم کۆڵانە بەڕێخەینەوە
بگەڕێینەوە بەرەو
منداڵێتی عەشق
منداڵێتی ژیان
منداڵێتی سەوزایی
وەک نیشتیمان و ماڵی دڵمان
هەمیشە شیرین و جوانە ئەم کۆڵانە
ئەگەر جارێکی تر لە دایک ببمەوە
حەزدەکەم هەر لەو کۆڵانە زەردەدا
چاو هەڵبێنمەوە
هەر لەو کۆڵانەش
لەگەڵ هەمان منداڵە چەتوونەکان گەورە ببم

پۆتینێک بکەمە پێ و لە نێو قوڕو لیتەکان بێم و بچم ...!
بەڵام هەمان چاوەڕوانی و هەمان تەنیایی و هەمان نامرادی نا
هەمان شەرمنۆکی و هەمان بە ئەنفالبوونی خەونەکانم نا
هەمان دڕاندن و سووتاندنی دەفتەری حەزو ئارەزووەکانم نا
نامەوێ جارێکی تر بەدیار مەرگی کاتژمێرەکان
چاوەڕوانی مردنی خۆم بکەم
ئەگەر ئەمجارە لە دایک ببمەوە
هەر لەهەمان کۆڵان
ناهێڵم کچۆڵەکان لەگەڵ کۆتر و کوکوختییەکان
لە نێو بیابانی ڕەشەبادا ون بن
ناهێڵم درەختەکان خۆیان لە با بتۆرێنن
گیا شەرم بکات خۆی بۆ باران ڕووت بکاتەوە
مانگ چیتر بە ڕووی کچۆڵە تەنیاکان پێنەکەنێ

دەرگاکان و پەنجەرەکانیش بێمەبەست دابخرێن
ئەگەر ئەمجارە لەدایک ببمەوە
بیست و چوارکاتژمێر و بەردەوام
دەخوازم
سروودەکانی خۆشەویستی و
لاوکەکانی بەختەوەری
هەمیشە هەر دەنگییان بێ
لە گۆڕەپانەکەی دەو مەجراش
ڕەشبەڵەک و دەهۆڵ و زوڕناکەی ( سەید کەریم )
حەوت شەو و حەوت ڕۆژ
وەکو جاران بمانهێنێتە سەما و گوێیەکانمان کاسبکا
ئەگەر ئەمجارە لە دایک ببمەوە
ژیان بە بەرینایی خۆی دەهێنمە نێو ئەو کۆڵانە

ئەو کۆڵانەش دەکەم  بە سومبوڵ و بە هێمایەک
بۆ ژیان و
بۆ عەشق و
بۆ مرۆڤبوون و
بۆ  هەموو گەردوون ...!

ئەیلوولی ٢٠١٦

# (کەمانجەیەک بەسەر شانی باوە)

١

لە تەنکایی بیرکردنەوە
بەرەو قووڵاییەکانی ئەندێشە
لە قووڵاییەکانی ئەندێشەوە
بەرەو کۆڵانە پێچاوپێچەکانی زمان
لەوێوەش /
بەرەو شەوگارە تاریکەکانی یادەوەری و
بەرەو ڕووبەرە نائاگاییەکانی خود
کردنەوەی بوخچەی نهێنییەکان و
وە قسەهێنانی دەمارەکانی ئارەزوو

لە دوورەوەش
کەمانجەیەک بەسەر شانی باوە دەبیندرێ
درەختەکان بە نەرمی خۆ دەهەژێنن
دەرگا کراوەکانی ڕووناکی دادەخرێنەوە
پەپوولەکان جێژووانگەکانییان جێدەهێڵن
سەوزایی لاوکی ونبوونی خۆی دەست پێدەکاتەوە
عاشقەکان لە نێو خەونە سپییەکانییان
نا ئارام دێن و دەڕۆن
با بە هێمنی سەمفۆنیاکەی دەژەنێ
هەور بێدەنگ بێدەنگ ئەم هەوارە جێدەهێڵێ
لە تەنکاییەکانی خەیاڵەوە
بۆ قووڵاییەکانی وەرزە بەسەر چووەکان
پیاسەکردنەوە لە نێو خەونەکانی ڕابردوو

گەمەکانی نێوان منداڵان و مانگ
ئەفسانەکانی نێوان ئەوین و ئەستێرە
گوێگرتنەوە لە چیرۆکە بەرئاگردانییەکان
بازبازێنێ لەسەر سینگی کۆڵانە سووتاوەکان
نووسینەوەی، زەردەخەنەی خەمەکان
کۆکردنەوەی مروارییە ڕژاوەکانی ئومێد
لەوێوەش نزیکبوونەوە لە پەنجەرە کراوەکان
بینینەوەی موسافیرە ماندووەکان
ئەوانەی /
ژیان و گەردوونییان بەسەرشانییان داداوە و
کۆڵان کۆڵان
شار بە شار
دێ بە دێ دەیگێڕن

ئەو باڵندانەش دەبیندرێن
کە بە نائارامی دەفڕن
درەختەکانیش /
بۆ باران و خاک دەچەمێنەوە
کەمانجەیەک بەسەر شانی باوە
لاوکی موحیبەت دەژەنێ
دەمانگەڕێنێتەوە نێو خەونە سپییەکان
ڕۆژە گەرمەکانی نێو دڵی بەفر
نێو باخچە ڕەنگاو ڕەنگەکانی ئەوین
گەڕان گەڕان گەڕان
گەڕان بەدوای وەڵامی ئەو پرسیارانەی
نامۆن بە خەونەکان و بە بوونی ئێمە
نامۆن بە ئەندێشەکان و بیرکردنەوەکانی ئێمە
گەڕان بەدوای ئەو ڕوخسارە گەشانەی

لە نێو وەهمەکانەوە دەبیندرێن
گەڕان بەدوای قاقای ئەو پێکەنینانەی
لە نێو خەیاڵەوە دەبیسترێن
هەر گەڕان و هەر گەڕان و هەر گەڕان
گەڕان بە دوای بوون و خەون
بە دوای پرسیار و گومان
بەدوای وەهم و حەقیقەت
لە نێو تەنکاییەکانی بیرکردنەوە
بەرەو قووڵاییەکانی ئەندێشە
لەوێوەش هەڵدانەوەی
پەڕپەڕی کتێبی خەونەکان
گوێگرتنەوە لە ئایەتەکانی ئومێد
شیعرە چاو بەفرمێسکەکانی عەشق
لاوژە جەرگبڕەکانی ونبوون
ژەنینەوەی سروودەکانی هەستانەوە

لاوکە گەرمەکانی مردن
لەوێوەش /
ئاوێتەبوون لەگەڵ
وەرزەکان و
زەمەنە زەندەقچووە بابردووەکان
گریان و هاژە هەمیشەییەکان
ڕەنگە خۆڵەمێشییەکانی نێو تابلۆکانی قەدەر
وردبوونەوە لە پەیکەرە زێڕینییەکانی خودا
خوێندنەوەی نامەی ئەو کچۆڵە شەرمنانەی
کە تەنها لە نێو نامەکاندا
زمانییان دەهاتە گۆ
شیرین شیرین دەیانگوت
بە ئەندازەی شەو نزیکم لە ڕووناکی
بە ئەندازەی باران نزیکم لە ڕووبار
بە ئەندازەی گیا نزیکم لە با

بە ئەندازەی خۆم نزیکم لە تۆ
لە نێو قووڵاییەکانی خەیاڵەوە
بەرەو هەوارگە ڕەنگاوڕەنگەکانی درەختەکان
نووسینەوەی جوانییەکانی گەڵاو گوڵ و
نهێنیەکانی ڕەنگە تۆخەکان
بێدەنگییە ئارامییەکانی سەوزایی
لەوێوەش بەرەو شەقامەکانی بروسکە
یان بەرە و مەملەکەتی ئەستێرە
ڕاکشانەوە لەسەر سیسەمی ڕووناکی
ڕێکخستنەوەی کتێبەکانی نێو دەلاقەکانی ئاگر
کردنەوەی بوخچە گرێدراوەکانی نێو قوژبنە تاریکەکان
دواتر گەڕانەوە بۆ کەنار دەریاکان و ڕووبارەکان
وردبوونەوە لە هاتنە دنیای شەپۆلەکان
لە هاوار و گۆرانییەکانییان
لە مەستبوون و مردنەکانییان

لەوێوەش ڕۆیشتن بەرەو
کیشوەرە دوور دوورەکان
بەهەشتە پڕ لە نوورەکان
هەر گەڕان و هەر گەڕان و هەر گەڕان
گەڕانەوە بۆ نێو
ئەشکەوتە ئاتەشییەکانی خود
مانەوە لەژێر کەپرە ڕەنگینییەکانی ئارەزوو
نەخشاندنەوەی پەیکەرە ئیرۆسییەکانی خەون
دیسانەوە خەون
هەر خەون و هەر خەون و هەر خەون
خەون خەون خەون
خەون خەون
خەون

٢

نیگارکێشێک
له سه‌ره‌تای
پشکوتنی خونچه‌ی ئومێده‌کانی
له سه‌ره‌تای هه‌ستکردن
به گه‌رمایی ده‌ماره‌کانی ڕۆح
به خوێن تابلۆی خۆزگه‌کانی ڕه‌نگ ده‌کات
له نێو تابلۆکانیدا
خه‌ونه‌کانی سوور سوور
خه‌یاڵه‌کانی سوور سوور
ئاره‌زووه‌کانی سوور سوور
فڕین له نێو
سه‌ده‌یه‌کی پڕ له خوێن و
زه‌مه‌نێکی پڕ له خوێن
هونه‌رمه‌ندێک

خوێن لە تابلۆکانی دەچۆڕێ
فلچەکانی
پەنجەکانی
پەراسووەکانی
چاوەکانی
ڕەنگەکانی
سوور دەچنەوە
سوور سوور سوور
نیگارکێشێک
نیگاری سەدەیەکی سوور و
زەمەنێکی سوور و
دنیایەکی سووور سوورمان بۆ دەکێشێ
شار و دێهاتەکانی سەدەی بیستەم
کۆڵان و باخچەکانی سەدەی بیستەم
ڕووبار و دەریاکانی سەدەی بیستەم

سوور دەچنەوە سوور سوور سوور
نیگارکێشێک نیگاکانی پڕن لە خوێن
نیگارەکانی سوور دەچنەوە
نیگارکێشێک خەونەکانی پڕن لە خوێن
خولیاکانی سوور دەچنەوە
نیگارکێشێک ئومێدەکانی پڕن لە خوێن
ئارەزووەکانی سوور دەچنەوە
لە نێو تابلۆکانی ئەم هونەرمەندە
ڕەنگەکانی تر
لە پشت ڕەنگە خوێناوییەکان
بە بێدەنگی خۆیان حەشارداوە
جار جارەش بە بێدەنگی
وێنەی نائومێدی
وێنەی مردن دەکێشن
وێنەی گۆڕستان

وێنەی دۆزەخ دەکێشن
وێنەی تفەنگ
وێنەی جەلادەکان دەکێشن
ڕەنگەکانی تریش
بە بێدەنگی هاوار دەکەن
کتێبی جەنگەکان دەنووسنەوە
ژیان چ ڕێکەوتێکی سەیرە !
تابلۆکانی ئەم نیگارکێشە
لە تابلۆکانی نیشتیمانی من دەچن
ڕەنگەکانی نێو تابلۆکانی نیشتیمانی منیش
بە بێدەنگی هاوار دەکەن
بە بێدەنگی گۆرانی دەڵێن
بە بێدەنگی پێدەکەنن
بە بێدەنگی کتێبەکانی عەشق دەنووسنەوە
بە بێدەنگی ئەفسانەی جەنگەکان دەگێڕنەوە

بە بێدەنگی گوێ لە سەمفۆنیای با دەگرن
بە بێدەنگی سەما دەکەن و
هەر بە بێدەنگیش دەمرن
ڕەشەباکان و هەورەکان و بروسکەکان و ئەستێرەکان و
درەختەکان و ڕووبارەکان و تاڤگەکان و چیاکان و
باڵندەکان و باخچەکان و شەوەکان و ڕۆژەکان و وەرزەکان و ...
هەموو شتەکان لە نیشتیمانی من بێدەنگن
عاشقەکان و موسافیرەکانیش بێدەنگن
تەنانەت مورید و پەیامبەر و خوداکانیش
بێدەنگی لە نیشتیمانی من
زمانی گیا و
زمانی خوا و زمانی خاک و
زمانی بەفر و زمانی سروشت و
زمانی هەموو بوونەوەرێکە
ژیان لە نیشتیمانی من

لە مردن دەچێ
مردنیش وەکو ژیان بێدەنگە
ژیان هێندە لە مردن نزیکە
ناتوانین لێکیان جیا بکەینەوە
لە نێو تابلۆکانی نیشتیمانی من
خۆرەتاو بە مردوویی هەڵدێ
بەیانییەکان بە مردوویی دەبریسکێنەوە
باران بە مردوویی دەبارێ
مانگ بە مردوویی دەڕوانێ
مرۆڤەکان بە مردوویی دێن و دەچن
کانییەکان و
جۆگەکان و
ڕووبارەکان
دەڕژێنە نێو
دەریایەکی پڕ لە شەپۆلی مردوو

با بە مردوویی کەمانجەکەی خستۆتە سەرشانی و
سەمفۆنیایەکی ناشازمان بۆ دەژەنێ
لە نێو تابلۆکانی نیشتیمانی من
ڕەنگە خۆڵەمێشییەکان و زەردەکان و سپییەکان و
سەوزەکان و ڕەشەکان و شینەکانیش
سوور دەچنەوە
وەک ڕەنگە مردووەکانی
سەردەمی جەنگەکان و
یان ڕەنگە بێدەنگەکانی
سەر ڕوخساری مردن
ڕەنگەکان سوور دەچنەوە و
خۆزگەکان و
خەونەکانیش ڕەش ڕەش

## ٣

نیشتیمانم
لە نێو وەهمەکانی عەشق
خۆم ونکرد و
لە نێو وەهمەکانی غوربەتیش تۆ
من بە چاوەکانی درەختەوە بۆت دەڕوانم
ئێستا بەم خەم و زام و برینەوە
ماندوو ماندوو
شەکەت شەکەت
لە کەناری مردن ڕاکشاوی
نیگاکانت لێڵ و خەمناک
گولاڵەی خەیاڵەکانت سیس و ژاکاو
منیش هێدی هێدی
بە قەڵەمی باران دەتنووسمەوە

خەونەکانت
وەک گەڵا سپییەکانی مردن هەڵدەوەرن
ڕەنگە گەشەکانی چاوەکانت
تا دێ کاڵتر دەبنەوە
منیش بە باڵای سنەوبەر
وەک هەمیشە بۆت دەچەمێمەوە
لەبەر غەریبی تۆ
غەریبی خۆم بیر چۆتەوە
نیشتیمانم
منیش ئەم دەور و زەمانەم لە بیرە
بوون و ژیانم پڕ بوون لە غەریبی
بیرم دێت
وەک پنجە گیایەک
یان کولیکە سوورێکی ناسک
دەمەویست هەناسە بە سروشت و ژیان بدەم

هەورە ڕەشەکان و
گەردەلوولە ڕەشەکان و
ڕەشەبایە ڕەش ڕەشەکان
هەڵییان تەکاندم
دووریان خستمەوە
دوور دوور دوور
لە خۆم دوور و
لە تۆ دوور ئەی نیشتیمان
دوور دوور دوور
لە ژیان و لە هەموو شتێک دوور
بیرم دێت
ڕۆژانێک /
پڕبووم لە ڕووناکییە پرشنگییەکانی بەیانییان
لە زەردەخەنە زێڕیتییەکانی پایزان
لە سەوزاییە سەرمەدییەکانی بەهاران

بە بیرم دێت
هەر بە پێکەنینەوەش هاتمە نێو ژیان
لە نێو ژیانەوە خەونم دەبینی
توند توند
باڵام لە باڵای ژیان ئاڵابوو
شل شل
گۆرانیم بۆ ژیان دەگوت
من کەسێک بووم
ژیان نیشتیمانی ئەبەدیم بوو
هەرگیز مردنم نەدەناسی
بێ ویستیخۆم
کراسی مردنییان لەبەرکردم
مردنیش هەر لەم ڕۆژەوە تاکو ئێستا
لە هەموو کاتێک و لە هەموو شوێنێک
هەر بەدوامەوەیە

مردنیش بۆ من لاشەیەکە و
ساڵەهایە بەسەریا دەڕۆم
نیشتیمانم
بە چاوەکانی خەون بۆت دەڕوانم
بە هەستەکانی تریفە
گوێت لێدەگرم
لەو کەمانجە ڕەنگینەش دەڕوانم
کە بە سەرشانی باوە دەبیندرێ
سەمفۆنیای خەونەکانی تۆم بۆ دەژەنێ
ئەو ڕۆژانەم دێنێتەوە یاد
شیعرەکانی خۆم
بە ڕووناکی شەوەکانی پایز دەلاواندەوە
دەماری ئارەزووەکانم
پڕ دەکرد لە لە بزە و نیاگا و
لە میهرە گەرماکانی تۆ

نیشتیمانم
ئێستاکەش چەندە غەریبی غەریب
دەرگای ژیانت بە ڕووی خۆتدا داخستووە
لە نێو کۆڵانە شێواوەکانی مردن پیاسە دەکەی
بوخچە شینەکانی هیواکانت
لە نێو ژوورە تاریکەکان جێهێشتووە
تەنیا تەنیا
وەک موسافیرێکی ون
بە پەیژەکانی نائومێدی هەڵدەگەڕێی
ناوی ڕووبار و باڵندە و گۆرانییەکانی عەشقت
بیرچۆتەوە
چەند غەریبی غەریب
وەک ئەو هەورە ڕەشانەی
بە دەم وەرزی دڵەڕاوکێی ئاسمانەوە دەردەکەون
وەک ئەو خۆرەتاوە تەنیایەی

بۆ پیربوونی بەیانییەکان فرمێسک دەڕێژێ
نیشتیمانم / ئەسەف بۆ ئەو ڕۆژانەت هەڵدەکێشم
تیشکی ڕووناکی ئومێدت
دەیدا لە پەنجەرە و ژوورەکانی ژیان و
ڕوخسارەکانی مانگ و ئەستێرە و
باخچە و باڵندەکانت
پڕ بوون لە نیگای گەرم گەرم
بێوچان
بە نێو ڕەشەبا و گەردەلوول ڕەتدەبووی
نیشتیمانم / ئێستا تۆ لە من غەریبتری
بە شەکەتی لە لێواری مردن ڕاکشاوی
ئێستا پشت لە ئاوەدانی و پشت لە کات و کاتژمێرەکان دەکەی
مرۆڤەکان و وەرزەکان و ڕووبارەکان و
شەقامەکان و عاشقەکان و موسافیرەکانت جێدەهێڵی
بە تاقی تەنێ هەر دەڕۆیت و ئاوڕ نادەیتەوە

بە تاقی تەنێ هەر دەڕۆیت و
هەر دەڕۆیت و هەر دەڕۆیت
بە تاقی تەنێ ئاوڕ لە کەس نادەیتەوە
هەر دەڕۆیت و
هەر دەڕۆیت و
لە مردن نزیک دەبیتەوە
نیشتیمانم /
بە تاقی تەنێ هەردەڕۆیت و
ئاوڕ لە کەس نادەیتەوە
بەتاقی تەنێ
لە مردن نزیک دەبیتەوە
ئاوڕ لە کەس نادەیتەوە و
بە تاقی تەنێ / تەنێ تەنێ تەنێ
ئاوڕ نادەیتەوە و هەردەڕۆیت ...!

**نیسانی ٢٠١٦**

# (نەوڕەسێک لەودیو هەورازەکانی تاریکییەوە)

١

لە ئێوارەیەکی ئەسمەری
دەنگێک لە ئاسمانەوە هاتە گوێم
لە نێو قووڵایەکانی شەو
لەودیو هەورازەکانی تاریکییەوە
لەودیو گوندەکانی بەهەشتەوە
دەنگێکی نەرم
وەک دەنگی نمنمەی باران
دەنگێک /
پڕ لە گڕ و پڕ لە بڵێسە
پڕ لە ئاواز و پڕ لە ئومێد

دەنگێک /
لە خەوە پڕ حەسرەتییەکانی بێهوودەییم
ڕایچڵەکاندم
ئەشکەوتەکانی غوربەت و
پەرستگەکانی تەنیایی و
خەلۆەتگەی خەونەکانمی
ڕووناککردەوە
ئەو دەنگە دەنگی فریشتەیەک بوو
بە زمانی عەشق قسەی دەکرد
بە زمانی پەرییەکانی دەریا و
حۆرییەکانی فیردەوس
بە زمانی ژنە ڕاهیبە ڕۆح تێشکاوەکان
بە زمانی ژنە ڕەوەندێکی ژێر ڕەشماڵی
نێو ئەفسانە مەزنەکان

## ٢

ئەی نەورەسیترین ژنی دنیا و
ئەی کۆچەریترین کەویاری عەشق
من ڕۆیشتمەوەو تۆش نەهاتی
تا / توند توند
بە خۆمت وەنووسێنم
پەڕ پەڕی
لێوەکانت بخوێنمەوە
توند توند بۆنت بکەم و
گەرمایی لەشت هەڵمژم

٣

ئەی نەوڕەسە
نەرمونیانە نەشمیلەکە
عەشق لەگەڵ تۆ
گەمەکردنە بە پشکۆکانی ئاگر
ڕەتبوونە بە نێو کۆڵانەکانی ڕەشەبا
دار وەردانە لە کونە زەردەواڵەکانی
ناو دیوارەکانی دۆزەخ
ڕاکشانە لەسەر پشتی
شەپۆلە سەرخۆشەکانی شێتبوون
لە خاچدانی گەردەلوولە
لە نێو گەردانە بێگەردەکانی نائومێدی

٤

هۆ / شەکرە ژنە شەرمنە شێتۆکەکە
وەکچۆن برسییەتی ڕێیەکی لە هارییە
دووری تۆش ڕێیەکی
لە نێو مەملەکەتی مردنە
دووری تۆ
ئاسمانێکە پڕ لە ئەستێرەی ڕەش
کتێبێکە لە ئاگر
گڕ لە کاتژمێری مەوداکان و
گڕ لە ناسنامەی وەرزەکان و
گڕ لە دەفتەری غەریزەکان / بەردەدات

٥

لەو ڕۆژەوەی دەنگی تۆ
لەودیو هەورازەکانی تاریکییەوە
هاتۆتە گوێم
خۆم و خەون و خەیاڵەکانمت
لەت لەت کردووە
لەتێکم وا بە ئاسمانەوەیە
تۆش بە قوڕگێکی پڕ لە گریانەوە
هەر دەڵێی
( توخوا زوو بگەڕێوە )
لەتێکم وا بە دەشت و کێوەکانی غوربەتەوە
هەموو ڕۆژێک
لاوکی تەنیاییم دەنووسێتەوە
لەتێکیشم لە نیشتیمان بەجێماوە

بۆ سەبووری و
هێوربوونەوەی
پەپوولە بێئۆقرەکانی
نێو گوڵزاری دڵی تۆ

٦

ئەی نەوڕەسە
نیگا شیرینە شلێرییەکەی
نێو ڕەز و باغ و باغاتەکەی شیعر
نوونەکانت لێکگرێ دەدەم
نەرم نەرم
ملوانکەیەکی ئاوریشمینیت بۆ دەنەخشێنم
نوونەکانت لێکگرێ دەدەم
نەرم نەرم
ڕووبارێک لە شیلەی ئارەزووە ئیرۆسییەکانت

بەسەر کێلگە تینووەکانی
مرۆڤ و باڵندە تەنیاکاندا دەڕژێنم
لە سەر گرد بەگردی خەونە سپییەکانیشت
تەنافێک
لە پیتە نارنجییەکانی ناو دڵت هەڵدەدەم
لە مەودواش
هەموو نوونە نەرمەکانی سەر لێوەکانت
دەکەمە ناونیشانی کتێبەکانم و
سەردێری شیعر و قەسیدەکانم

٧

ئەی میوانە ناوەختەکە و
ئەی شەونووری شەوانی عەشق
تۆ گەوهەرێکی پڕ لە گوڵ و
گوڵدانێکی پڕ لە گەوهەر

تۆ ڕازێکی پڕ لە ڕۆندک و
ڕۆندکێکی پڕ لە ڕاز
تۆ خەونێکی پڕ لە خۆرەتاوی و
خۆرەتاوێکی پڕ لە خەون
تۆ ئەستێرەیەکی پڕ لە ئەوین و
ئەوینێکی پڕ لە ئەستێرەی
تۆ تریفەیەکی پڕ لە تاسانی و
تاسانێکی پڕ لە تریفەی
هەموو شەوێک لە نێو
بوون و بۆشایی بیرکردنەوەکانم
دەدرەوشێیتەوە
کەلێن و گۆشەو قوژبنە تاریکەکانی
دەمار بە دەماری
ئارەزوو و ئومێدەکانم
ڕووناک دەکەیتەوە

## ٨

دەنگ دێ
دەنگ دەنگ دەنگ
لەنێو کێو و دۆڵەکانەوە
لەنێو ئاسمان و لە دەوروبەری ئەستێرەکانەوە
دەنگ دەنگ دەنگ
لەودیو هەورازەکانی تاریکییەوە
لەودیو باخچەکانی بێهوودەییەوە
لەودیو تاوێرەکانی تەنیاییەوە
دەنگێک /
لە نەورەسێکی نیشتیمانەوە دێ
هەردێ و هەردێ و هەردێ

٩

تەق
تەق تەق تەق
تەق تەق تەق تەق تەق
تەق تەق تەق تەق تەق تەق تەق
بە یارمەتی خۆت ئەم دەرگایە بکەرەوە
بوەستە دەرگای ماڵەکەت نا
دەرگای دڵتم بۆ بکەرەوە
ئەی نەورەسی من
دەرگای دڵتم بکەرەوە
با وردە ئەستێرە دوور دوورەکانی نائومێدی
لە خۆرەتاو و خاک نزیک ببنەوە
با مانگ و خوداکانی عەشق
پشت لە بازنەی تەنیایی بکەن

لەگەڵ ئاوەدانی ئاشت ببنەوە
ئەی شلکە ڕێواسەکەی
بنار زورگە بێناوەکەی زەمەن
لە دووری دوورەوە هاتووم
تاسەو سووتان و غوریبی تۆ
چەندین وڵات و
چەندین کیشوەر و
چەندین ئۆقیانووسی پێ بڕیوم
دەرگای دڵتم لێبکەرەوە
ماندووم و هاتووم
بۆ چەند ڕۆژێک
یان چەند کاتژمێرێک
یان /
گەر چەند خولەک و چرکەیەکیش بێت
لە باوەشی تۆ

سەر خەوێک بشکێنم
لەژێر ساباتی ئەم عەشقەت
پشوویەک بدەم و بحەسێمەوە
دەی دەی دەی
ئەی نەوڕەسە ژن
دە دەرگای دڵتم بۆ بکەرەوە
دەی دەی دەی
دە بیکەرەوە دەی ...!

**ئۆکتۆبەری ٢٠١٦**

# سوور ڕەشێکی نوێی یە

مرۆڤێکی بەرزە فڕ
فڕینێکی بەرز بەرز بەرز
مرۆڤێکی باڵا و بڵند
بڵندتر
لە تەمە سپییە سوورمەییەکانی سەرمەدی
بڵندتر
لە سنەوبەرە سەوزەکانی عەشق
مرۆڤێک
دەمارەکانی ئارەزووی لە ئاوریشم و
چاوەکانی لە تریفە
پەنجەکانی لە با
ڕۆحی لە تەمتوومان

مرۆڤێک سوورتر لە بەفر
بێهوودەتر لە باران
تەنیاتر لە خودا
ئەو مرۆڤە فێری کردم
بە جیا لە هەموو کەس
بە جیا لە هەموو شتێک
بە جیا لە دوێنێی تۆ
بە جیا لە سبەینێی خۆم / بیربکەمەوە
فێری کردم
لاسایی هیچ کەسێک و
بە زمانی هیچ کەسێک قسە نەکەم
تەنها خۆم بم و هیچی تر
ئەو مرۆڤە باڵا زراڤە
فێری کردم
لە هەموو شتێک بە گومان بم و

گومان لە هەموو شتێک بکەم
گومان لە ئاو
کە هەمیشە
بە یەک ئاواز سەمفۆنیاکانی دەژەنێ
گومان لە خۆرەتاو
کە هەمیشە
لە دیوێک دەردەکەوێ و
لە دیوەکەی تر ئاوا دەبێ
گومان لە بەرد
کە هەمیشە
ژیان دەمرێ و
یان مردن زیندوو دەبێتەوە
ئەو هەرگیز وتەیەک لە دەمی دەرنایە
من بە گومانم لە خۆم
کە بێ مەبەست هاتمە دنیا

بە گومانم لە تۆ
کە بێ مەبەست جێتهێشتم و
بێ مەبەستیش لێم دوور کەوتییەوە
یان ئەو دەمانەی
بۆم دەنووسی و دەڵێێ
تۆ لە کوێی شاعیرە ڕۆژهەڵاتییەکەم
من هەر بەدوات دا دەگەڕێم و ناتدۆزمەوە
لە کاتێکدا /
کێڵگە ئارامەکانی
نائومێدی و گەردەلوول و ڕەشەبا
ماڵی هەمیشەیی منن
من حەزدەکەم
ئەبەدییەتی هەموو شتە ئەبەدییەکان بگۆڕم
یان / هەقیقەتی هەموو شتە هەقیقەتەکان
توورِ هەڵبدەم
بۆیە هەمیشە ئارەزوو دەکەم

وەرزێک لە باکووری خەونەکانم بم
وەرزێکیتر / لە باشووری بۆشایی
وەرزێک لە پەرستگەکان بەرماڵ ڕابخەم
وەرزێکیتر /
حۆرییەکانی بەهەشت لە خودا بتۆرێنم
من دەمەوێت
خۆم بدۆزمەوە ئینجا بەدوای تۆدا بگەڕێم
یان کاتێک
کە لەگەڵ تۆدا پیاسە دەکەم
هەست بکەم
ئەوە منم لە تەنیشت تۆوە ڕێدەکەم
لە تەنیشت تۆوە ڕێدەکەم و قسەت بۆ دەکەم
قسەت بۆ دەکەم و لەگەڵ تۆدا پێدەکەنم
یان تۆ
کاتێک لە تەک مندا ڕادەکشێی

هەست بەوە بکەی
ئەوەی تۆی
لە تەک منا ڕاکشایت و
ئارەزوو دەکەی زێتر لە چاوەکانم ڕابمێنی
ئیدی /
نە من لە ناو تۆدا ون ببم
نە تۆش لە نێو مندا خۆت نەناسیتەوە
یان / گوڵەباغم
با لاپەڕەیەکی نوێ هەڵدەینەوە
لاپەڕەیەکی سپی نا
لاپەڕەیەکی شین شین
چی دەبێ
با ئەستێرەکانی ئومێدمان
لە نێو دەریاکانەوە دەرکەون
کانییە سازگارەکانی عەشقیش

لە ئاسمان
با ڕووناکی چاوەکانمان
لە نێو شەوە ئەنگوستەچاوەکان بدۆزینەوە
پێکەنین و خەونەکانیشمان
لە نێو قووڵایی گریان
گوڵەباغم ...
ئیتر لەمەودوا
سوور ڕەشێکی نوێیە و
با بەس خۆمان بین و هیچی تر ...!

**ئۆگستی ٢٠٠١٦**

تێبینی / بۆ ناونیشانی ئەو قەسیدەیەم سوودم لە تایتلی درامایەکی ئەمریکی بینیوە .

# گوڵە سپی

وەک چۆن تۆ پڕی لە شەبەنگ و
لە شکۆفە ناسکەکانی جوانی
منیش پڕم لە تەرزە و  تریفەکانی تەنیایی
وەک چۆن تۆ پڕی لە نەسیم و
شنەبایە فێنکەکانی ڕووناکی
منیش پڕم لە گەڵا و
لە درەختە بێدەنگەکانی  بێهوودەیی
ئەی گوڵە سپییە ڕۆح گێلاسییەکە
ناخی تۆ
سپییترە لە مەمکۆڵەکانی بەفر
لە وشە ئیرۆسییەکانی شیعر

لە حەرفە سەرمەدییەکانی هزر
من هەمیشە و هەمیشە
لە نێو نیگاکانمدا
بۆ گوڵە سپییەکان دەچەمێمەوە
ئەو دەمانەی لە چاوەڕوانی پەپوولەکان
لەسەر چوارپایەی ئارەزوو
خۆیان ڕووت دەکەنەوە
لە نێو خەونەکانمدا
گوڵە سپییەکان تێر تێر بۆن دەکەم
ئەو دەمانەی مەست مەست
لە ئەستێرە سوورەکان دەڕوانن
لە نێو بینینەکانمدا
وێنەی گوڵە سپییەکان دەکێشم
ئەو دەمانەی
لەبەردەم تیشکە زێڕینییەکانی پایز
زەردەخەنە گەرمەکانییان

به ئەڤیندارە نامورادە دڵگەشەکان دەبەخشن
گوڵەگیانم
من بە سپییێتی مەمکۆڵەکان و
بە سەوزێتی چاوەکان و
بە شینێتی  نیگاکان و
بە سوورێتی لێوەکان و
بە زەردێتی خەیاڵەکانی تۆوە
تابلۆ ڕەنگینەکانی عەشق دەکێشم
گوڵەگیانم
تۆ / ڕووبارێکی بە خورپەی وەک باران
بارانێکی بە غەمزەی وەک ڕووبار
بەسەر پێدەشتە تامەزرۆییەکانی عەشقدا دەبارێی
تۆ / خۆرەتاوێکی ڕوونی وەک خوناو
خوناوێکی ڕەوشەنی وەک خۆرەتاو
بەسەر پەنجەرەکانی عەشق دێیتە خوارێ

باخچەیەکی ڕەش ڕەش ڕەش
شەوێکی سوور سوور سوور
گوڵێکی سپی سپی سپی
سپییتر لە برژانگەکانی ڕووناکی
سپییتر لە سنەوبەرەکانی فیردەوسی
گوڵە سپییەکان /
لە بنار شاخە بەرزەکانی دۆزەخ
بە تەنیا لە دایک دەبن
لە نێو گوڵدانە شینەکانی دەریاش
باڵا دەکەن
گوڵە سپییەکان /
لە نیو نیشتیمانی ئاگر
لە حەژمەت
وشکهەڵاتنی مەمکۆڵەکانییان
نامورادانە هەڵدەوەرن

لەودەمانەش
باران بە نائومێدی دەباری
کاتژمێرەکانیش لەنێو بێدەنگیدا ون دەبن
گوڵە سپییەکان
لە نێو وەرزەکانی مردن
لە نێو باخچەکان و
لەسەر شەقامەکان و
لە نێوماڵەکاندا
پەڕ پەڕ لەگەڵ بادا هەڵدەوەرن
ژیان لە نێو کاتژمێرە ونبووەکاندا
هێدی هێدی
سەرگەردان دەسووڕێتەوە
تاو تاو
باخچەی ماڵەکانی خوداش
بە گوڵە سپییەکانەوە دەدرەوشێنەوە

گوڵە سپییەکان تا مردن
لە چاوەڕوانی دەرکەوتنەوەی
هەورە سپییەکان و
گەشبوونەوەی پشکۆکان و
گەرمبوونەوەی شەپۆلەکانن
گوڵە سپییەکان
تا مردن
لە چاوەڕوانی
زەمەنە سپییەکان و
گزنگە سپییەکان و
وەرزە سپییەکانن
لە ئامێزی
پرشنگی خۆرەتاوێکی سپی سپی
سروودە گەرمەکان دەڵێنەوە
منیش لە چاوەڕوانی

گوڵێکی سپی سپی
مەرکانەکانی نائومێدی
پڕدەکەمەوە لە گوڵ و
شەوەکان پڕ لە تریفە و
بزەکان پڕ لە باران و
خەونەکان پڕ لە خوناو و
نیگاکان پڕ لە گڕ و
منیش لە چاوەڕوانی
گوڵە خونچەیەکی سپی سپی
وەکو جاران
لە نێو خەیاڵە گەرمەکانی خۆم
لەبن دار هەنجیرێکی ماندوو
لە نێو سەمفۆنیایەکی کپ و خامۆش
یان / لەسەر جۆلانەیەکی ئاوریشمینی
گوڵێکی سپی سپی ڕادەژەنم

ئەی گوڵەباخە ڕەنگ گەنمییە
چاوڕەشە نیگا سپییەکەم
دڵنیابە و دڵنیا
هەروەکجاران
لەنێو سەفەر و مردنە سپییەکانم
لە نێو وەرزە خۆڵەمێشییەکانی
ئەو عەشقەم
لە بەردەم پەنجەرەیەکی کراوەی
نێو باو
تەمە سپییەکاندا
لە نێو ئاوێزانبوون و توانەوەم
لە نێو گەرمایی جەستە و
چاوە پڕ لە خومارییەکانی تۆدا
بۆ هەمیشە و تائەبەد
لە ژێر دەوار و

نێو هەوارگە و
پەرستگە ڕووناکە سپییەکانی عەشقدا
قەسیدە درێژە گەرمەکانت
بۆ دەنووسمەوە
دڵنیابە و دڵنیا
وەک هەمیشە و تائەبەد
لەنێو خۆم و خەونەکانم دەتنووسمەوە
وەک حیکایەتێکی نەبڕاوەش
بۆ نەوەکانی داهاتوو
شار بەشار و دێ بەدێ
ساڵ بە ساڵ و سەدە سەدە و
پشتاو پشت / دەتگێڕمەوە ...!

**کۆتایی دیسەمبەری ٢٠١٦**

(٢٠١٦)

ئەی تەمەن لێرەدا بوەستە
چ بەدبەختییەکی گەورە بوو
لە کاتێکی ناوەخت هاتینە دنیا
لەوەش بەدبەخت تر
بە نێو شەوەکان و
بە هەورازە سەختەکانی
ئەم ساڵە شوومەدا دا تێپەڕین
بە نێو کۆڵان بە کۆڵان و ژوور بە ژووری
ئەم ساڵە تاریکەدا تێپەڕین
بە نێو هەموو ڕۆژ و مانگ و وەرزەکانی
ئەم ساڵە بێ سەمەرەدا تێپەڕین

ساڵێکی پڕ لە ئافات و پڕ لە جەنگ و پڕ لە مردن
ساڵێک / پڕ لە خنکاندنی خەونەکان
ساڵێک / پڕ لە ڕژاندنی چاوی ڕازەکان
ساڵێک / پڕ لە مردنی مرازەکان
ساڵێکی خوێناوی و سوور سوور
ساڵێکی ڕەشی شووم شووم
ئەی تەمەن لێرەدا بوەستە
بەم هەمو برین و زامەوە
چۆن دەڕۆی بۆ نێو ساڵێکی تر
بەم هەموو فرمێسک و گریانەوە
چۆن دەڕۆی بۆ نێو ڕووبارێکی تر
بەم هەموو خۆڵەمێش و خوێنەوە
چۆن دەڕۆی بۆ نێو تابلۆیەکی تر
ئەی تەمەن لێرەدا بوەستە
ئارەقەی شەرمەزاری بڕێژە

کە بەهاکانی /

هەموو ژیان و بوون و

بەهاکانی /

هەموو شتە جوانەکانت

بڕۆ لەسەر شۆستەکان و

لە نێو تونێل و زێرابەکان دا کۆکەرەوە

ئەی تەمەن لێرەدا بوەستە

ئەی مرۆڤ / لێرەدا بوەستە و

پەتێک هەڵواسە بۆ خۆت

بەم هەموو برسییەتی و ناڵە ناڵەوە

بەم هەموو جەنگ و مردنەوە

بەم هەموو خوێن و خنکانەوە

بەم هەموو خەمۆکی و شێتبوونەوە

بەم هەموو دۆڕان و تێشکانەوە

چۆن دەڕۆی بۆ نێو ساڵێکی تر

چۆن دەڕۆی بۆ نێو گۆڕستانێکی تر
چۆن دەڕۆی  بۆ نێو دۆزەخێکی تر
ئەی تەمەن
تکایە لێرەدا بوەستە
هەموو کاتژمێرەکان و
هەموو وەرزەکان و
هەموو ساڵەکانی
عەشق و موحیبەت تێپەڕین
لێرەدا بوەستە ئەی تەمەن
مەڕۆ بۆ نێو ساڵێکی تر و
دۆزەخێکی تر و مردنێکی تر
ئەی تەمەن / لەو نوختە ڕەشە بوەستە زێتر مەڕۆ
لە نێو ئەم گۆماوە ڕەشە پڕ خوێنە بوەستە / زێتر مەڕۆ
لە نێو ئەم وەرزە ڕەشە وشکەڵانییە بێ گوڵەگەنمە بوەستە / زێتر مەڕۆ
لە نێو ئەم مۆڵگە و مەزرا و مەرزە ڕەشانەی مردن بوەستە / زێتر مەڕۆ

بوەستە ئەی تەمەن
بەم هەموو بەرگە ڕەشەوە
بەم هەموو جەستە ڕەشەوە
بەم هەموو دڵە ڕەشەوە
بەم هەموو خەونە ڕەشەوە
بەم هەموو مێژووە رەشەوە / بۆ کوێ دەڕۆی
ساڵێکی شووم شووم شووم
ساڵێکی ڕەش ڕەش ڕەش
لێرەدا بوەستە ئەی تەمەن
تا هەموو /
خنکان و مردن و کۆچ و برسییەتی و ئافاتەکانت
دەبن بە بیرەوەری
لێرەدا بوەستە ئەی تەمەن
تا دەبیت /
بە باخچەیەک لە ڕووناکی

بە تاڤگەیەک لە ئارامی
بە گوڵدانێک لە خەندەی سپی
لێرەدا بوەستە ئەی تەمەن
تکایە مەڕۆ
بۆ نێو ساڵێکی تر و
بۆ نێو گۆڕستانێکی تر و
بۆ نێو دۆزەخێکی تر
تکایە مەڕۆ ئەی تەمەن
مەڕۆ تکایە ...!

٢٠١٦ / ١٢ /٣١

# یاخیبوون

بە تەنیشت گۆڕستانی کات و
باخچە شینەکانی بەفر
بەنێو پەراسووەکانی ڕەشەبا و
نیگاکانی بروسکەدا ڕەتدەبم
دەڕۆم و
بەسەر هەورازەکانی ئاگر
بەسەر جەستەی
بەیانییە سەرخۆشەکان و
وەرزە ونبووەکان / تێدەپەڕم

دەڕۆم و بەسەر
هەورازەکانی سەوزایی و
دۆڵە تاریکەکانی تەنیایی / تێدەپەڕم
دەڕۆم و
ڕێگاکانی بەردەمیشم هەر درێژ دەبنەوە
دەڕۆم و دەستەکانم لەنێو گیرفانەکانم دان
حەزدەکەم بەس گوێم لە دەنگی باڵندەکان بێت
دەڕۆم و بیر لە تەنیایی خۆم و
بیر لە تەنیایی نیشتیمانم دەکەمەوە
چ کارەساتێکی مەرگئامێزە
نیشتیمان تەنیا بێت
تەنیا و تەنیا و تەنیا

دوور
لە خۆرەتاو و خەون و خۆزگەکان
تەنیا و تەنیا و تەنیا
دوور
لە ئەستێرە و گوڵەگەنم و کێڵگەکان
تەنیا و تەنیا و تەنیا
دوور
لە ژیان و عەشق و مرۆڤەکان
لێرەدا دەگەینە خاڵی کۆتایی
کۆتایی /
ڕێگاکان و ڕەنگەکان و ڕازەکان
دەگەینە ڕووبەرێک

لەوێندەرێ
درەختەکان بە مردوویی هەناسە دەدەن
تاڤگەکان بە مردوویی هاژەیان دێ
شەوەکان بە مردوویی
دووبارە دەبنەوە
جەستەی /
کاتژمێرەکان و
ئەستێرەکان و
گەردەلوولەکان
لەسەر شۆستەکانەوە دەبیندرێن
ڕێگاکانیش هەر درێژ و درێژ دەبنەوە
درێژ /
بە قەد تونێلە درێژەکانی تاریکی

منیش هەردەڕۆم
بە پێچەوانەی هەموو ئاراستەکان و
بە ئاراستەی هەموو پێچەوانەکان
دەڕۆم و دەستەکانم لەنێو گیرفانەکانم دان
بیر لە تەنیایی خۆم و تەنیایی ژیان دەکەمەوە
چ کارەساتێکی مەرگئامێزە
ژیانیش تەنیا بێت
وەک من و نیشتیمان تەنیا
تەنیا و تەنیا و تەنیا
دوور لە خەون
دوور لە خۆرەتاو
دوور لە خۆشەویستی

بەتاقی تەنێ
لەنێو مردندا ڕاکشابێ
ڕێگاکانیش هەردرێژ و درێژ دەبنەوە
درێژ و درێژ و درێژ
بە قەد درێژی
سپیدە سپییەکانی ڕووناکی و
پێدەشتە خاکییەکانی خەیاڵ
منیش هەر دەڕۆم
بە پێچەوانەی هەموو ئاراستەکان و
بە ئاراستەی هەموو پێچەوانەکان
هەر دەڕۆم و
گوێ لە سەمفۆنیای سنەوبەرە تەنیاکان و
ئەستێرە ئیرۆسییەکان ڕادەگرم

دەڕۆم و بە پێچەوانەی
ئاراستەی شەپۆلە شێتەکانی ئاو
بەڵام / تەریب لەگەڵ ئازادی
دەڕۆم بە پێچەوانەی
ئاراستەی شنەبایە شینەکانی بەیانی
بەڵام / تەریب لەگەڵ بەهاکانی جوانی
دەڕۆم
بە پێچەوانەی ئاراستەی
خەونە سەرشێتییەکانی ژیان
بەڵام / تەریب لەگەڵ بەهاکانی سەوزایی
هەر دەڕۆم و دەستەکانم لە نێو گیرفانەکانم دان
خەیاڵەکانیشم بە نێو تاوەری تەنیاییم ڕەتدەبن

ئاونگی ئارەزووەکانیشم
تنۆک تنۆک
دەڕژێنە نێو کێڵگە تاریکییەکانی
تەنیایی خۆم و
تەنیایی نیشیتیمان و تەنیایی ژیان
تنۆک تنۆک
تێکەڵ بە تەڕێتی تەنیایی خۆم و
تەڕێتی تەنیایی نیشتیمان و
تەڕێتی تەنیایی ژیان دەبمەوە
شیلە شەبەنگە شلێرییەکانی
وشە و شیعرەکانیشم
تنۆک تنۆک

دەڕژێنە نێو
شەوەکانی
تەنیایی خۆم و
شەوەکانی تەنیایی نیشتیمان و
شەوەکانی تەنیایی ژیان
منیش هەردەڕۆم و
ڕێگاکانی بەردەمیشم هەردرێژ دەبنەوە
درێژ و درێژ و درێژ
خەیاڵەکانیشم / بەنێو ئاوەڕۆی ئومێدەکانم ڕەتدەبن
هەر دەڕۆم / بە پێچەوانەی هەموو ئاراستەکان و
بە ئاراستەی هەموو پێچەوانەکان
تا چرکە بە چرکەی خەونەکانم
ئاوس دەبن بە ڕووناکی

دەمار بە دەماری نائومێدییەکانیشم
ئاوسدەبن بە خۆشنوودی
ڕێگاکانیش هەردرێژ دەبنەوە
درێژ و درێژ و درێژ
من هەر دەڕۆم و
ڕێگاکانیش بەدوامەوە
با هەر درێژ و درێژ ببنەوە

**ئەپریلی ٢٠١٧**

# سێگۆشەیەک

من لەنێو سێگۆشەیەکی
ڕەنگ خۆڵەمێشی هاتمە دنیا
هەر لەنێو ئەم سێگۆشەیەدا
بۆ یەکەمینجار
چاوم بە ڕووناکییەکی تاریک کەوت
چاوم بە بنمیچێکی گزیری و
ژوورێکی پڕ دەلاقە و
تاقیسکەیەکی بڵند و
فانۆسێکی کز و
ئاوێنەیەکی درێژ و

چاوم بە سندوقێکی ڕەنگاوڕەنگ کەوت
هەر لەنێو ئەم سێگۆشەیەدا زمانم هاتە گۆ
فێری ئەوەبووم بڵێم ( نا )
لەنێو ئەم سێگۆشەیەدا
خەمی نان و ئازارەکانم
بوون بە یەکەمین مامۆستام
کتێبیش بوو بە نزیکترین هاوڕێم
ئازادیش منی بە شیعر ئاشناکرد
لە کتێبەکانمەوە فێری ئەوەبووم
هەمیشە خەون ببینم
مامۆستاکەشم فێریکردم
بەدوای خەونەکانمدا بڕۆم

لە قەڵەمەکەشم فێری ئەوە بووم
ببم بە خۆم و هەمووەدەم هەر خۆم بم
هەر خۆم بم و
ملکەچی هیچ هێزێکی ئاسمانی و
هیچ پاشا و گەدا و کوێخایەک نەبم
لەنێو ئەم سێگۆشەیەدا
عەشق فێری ئەوەی کردم
بەسەر پشتی مەرگ بازبدەم و نەکەوم
بەنێو کۆڵانە پێچاوپێچەکانی
گەردەلوول و ڕەشەبا و تۆفان
تێپەڕم و نەکەوم
بەنێو ئۆقیانووسی
نائومێدی و تەنیایی و عەبەسییەتدا
بپەڕمەوە و نەکەوم

لە کاتی دەرگا لەسەرخۆداخستن و
لەنێو خەیاڵە شوومەکانی خۆکوشتنیش
شیعر دەستم دەگرێت و
بە چرپەوە پێمدەڵێت
( ئەی شاعیرە ڕۆژهەڵاتییەکە
هەڵسەوە
خۆرەتاو فەرشی نارنجی بۆ ڕاخستوویت
بەردەوامبەوە / تۆ لەودیو سنوورەکانی مردنیت ...! )
هەر لەنێو ئەم سێگۆشەیەدا
فێری ئەوە بووم
خۆم و خەونەکان و
مرۆڤ و ماسییەکان و
ئومێد و ئاوێنەکان و

پاییز و پەپوولەکان و
باران و باڵندەکان  و
نەسیم و نێرگزەکان و
شەپۆل وشەوەکان  و
بروسکە و باخچەکان و
ڕێواس و ڕووبارەکان و
سێو و سنەوبەرەکان و
هەموو شتەجوانەکانم خۆشبوێن
ئەم سێگۆشەیەی من
گۆشەیەکی بە نوونی نیشتیمان و
گۆشەیەکیتری بە میمی مرۆڤ و
دواهەمین گۆشەشی
بە ئای ئازادی / دەوەرە دراوە

نوون نوون نوون
میم میم میم
ئا ئا ئا
نیشتیمان / مرۆڤ / ئازادی
مرۆڤ / ئازادی / نیشتیمان
ئازادی / نیشتیمان / مرۆڤ
هەمیشە وا هەستدەکەم
من بۆ /
نیشتیمان و مرۆڤ و ئازادی
هاتوومەتە دنیا
هەر بۆیە لەوەتەی هەم
عاشقی ئازادی و نیشتیمان و مرۆڤم
لەوەتەی هەم

هەر بۆ /
مرۆڤ و ئازادی و نیشتیمان
دەنووسم
چونکە هەر لە ئەزەلەوە
من پێکهاتە و من هاوکێشە و
من شنەبای / ئامانجێکی سەرکەشم ...!

**حوزەیرانی ٢٠١٧**

# هەمیشە ئاشبەتاڵ

وا پێدەچێ
قەدەری ئێمە وابووبێ
لەنێو منداڵدانی مردنەوە
لەدایکبووبین
بۆیە فرچکمان بەوە گرتووە
بۆ تا ئەبەد
لەنێو مردندا بژین
لەنێو مردندا عەشق بکەین
لەنێو مردندا سروود بڵێین
لەنێو مردندا سەما بکەین
هەر لەنێو مردنیشدا بمرین
وا پێدەچێ
قەدەری ئێمە وابووبێ
کە لەنێو تەلبەندە تاریکەکانی مردنەوە

بۆ یەکەمینجار
دەرگای ژیانمان لێکرابێتەوە
بۆیە فرچکمان بەوە گرتووە
بۆ تا ئەبەد
ڕووناکی مردن لەنێو چاومان بێ
خۆرەتاوی مردن لەنێو خەونەکانمان بێ
کە دەشفڕین
درەختێک نەبێ لەسەری بنیشینەوە
کە لەنێو شەوە ئەنگوستەچاوەکانیش وندەبین
دەرگایەک نەبێ لێی بێینە دەرەوە
لەسەر یەکبەیەکی ئەستێرەکاندا
لەسەر زەوی و
لەنێو بۆشایی ئاسماندا
بستە خاکێک نەبێ
بیکەین بە نیشتیمان و ماڵ
هەر / ئاشبەتاڵ و هەمیشە ئاشبەتاڵ ...!

**ئۆکتۆبەری ٢٠١٧**

# (کتێبە خوێناوییەکانی نێو دەلاقەی نیشتیمان)

**- کتێبی یەکەم**

نیشتیمانم
تۆ کتێبی حیکایەتێکی درێژی
من هەموودەم دەتخوێنمەوە
بەدەم خەیاڵ و بیرکردنەوەکانم
بەدەم گەڕان و پیاسەکانم
بەدەم ڕاکشان و خەوەکانم
تەنانەت لەنێو خەون و
هەستە لاشعورییەکانیشم
هەر دەتخوێنمەوە
ئێستا / پەڕ بەپەڕ و
پیت بە پیتی وشەکانت خوێنییان لەبەر دەڕوا

ئێستا / خەیاڵ و بیرکردنەوە و
گەڕان و پیاسە و
ڕاکشان و خەوەکان و
تەنانەت / خەون و هەستە لاشعورییەکانی منیش
پڕبوون لە خوێن
هەر خوێن و هەر خوێن و هەر خوێن
نیشتیمانم
من ئێستا وەک تۆ تەنیام
وەک ئاگر بێهوودەم
وەک گەردەلوول و بروسکەش نا ئارام
وەک مێژووشم پڕم لە زام

- **کتێبی دووەم**

نیشتیمانم
لە تاریک و ڕوونی
بەرەبەیانی شانزەی ئۆکتۆبەردا
لە پڕێکدا
زەمەن هاتە هاوار و
زەوی هاتە هەژان

خۆرەتاو بە خەرەندان و
بە کێوان کەوت
کەڵەشێرەکان / لەنێو کۆریتەکان خۆیان مەڵاسدا
زارۆکەکانی ناو بێشکە
بە ڕوخسارێکی فۆبیاییەوە
لە جەستە بەفرینییە گرمۆڵەبوویەکەی
دایک و باوکییان دەڕوانی
منیش هەر لەوکاتە
جەنگێک لەنێو جەستەم هەڵگیرسا
بە دەستەکانی خۆم
لە دووچاو / چاوێک و
نیوەی پەنجەکان و
دوو ژووری دڵ و
دەستی ڕاست و
قاچی چەپە و
گورچیلەیەک و
نیوەی پەراسووەکانم / لەدەستدا
من ئێستا
کەسێکی پەککەوتە و نیوە مرۆڤم
منیش ئێستا
دەمار بە دەمار و
شانە بە شانەی جەستەم
خوێنییان لەبەردەڕوا

نیشتیمانم
منیش ئێستا
وەک تۆ تەنیام
وەک ئاگر بێهوودەم
وەک گەردەلوول و بروسکە نا ئارام
وەک مێژووشم پڕم لە زام

- کتێبی سێیەم

نیشتیمانم
ڕۆبۆت و داهۆڵە بێگیانەکان
کۆیلە و کەڵەپووچەکان
بەسەر لاشەی ئازادیدا دەڕۆن و
سروودیش بۆ ئازادی دەچڕن
بەسەر لاشەی مافی تاکدا دەڕۆن و
هوتافیش /
بۆ مافی تاک و کەرامەتی تاک لێدەدەن
بەسەر لاشەی خودادا دەڕۆن و
دەست بۆ ئاسمان بەرز دەکەنەوە و
باس لە بەها و پیرۆزییەکان و
ئاگریش لەهەمووشتێک بەردەدەن

نیشتیمانم چ قەدەرێکی ناڕوون و ڕەشە
هەر دەڵێی لەنێو منداڵدانی مردنەوە
سواری کەشتی درۆ بووین و
هاتووینە نێو بیابانێکی چۆڵ و هۆڵەوە
بەڵام پڕ لەخوێن و پڕ لە درۆ
هەر درۆ و هەر درۆ و هەر درۆ
بیابانێکی خاڵی لە فیکر و خاڵی لە بەهاکانی مرۆ
دەزانم نیشتیمانم
ئێستا تۆش
وەک من تەنیای
وەک ئاگر بێهوودەی
وەک گەردەلوول و بروسکە نا ئارام
وەک مێژووشم پڕی لە زام

**کۆتایی ئۆکتۆبەری ٢٠١٧**

## - کتێبی چوارەم

نیشتیمانم
پاییز لە بەردەمی ماڵەکانمان پاڵکەوتووە و
تادێ
مەوداکانی
نێوان غوربەت و تەنیاییش
بەرین و بەرینتر دەبنەوە
تادێ
برینەکان بەسۆتر و
ژیان بچووکتر دەبێتەوە
تادێ
دۆزەخەکان ڕووناکتر و
خەونەکانیش تاریکتر دەبنەوە
نیشتیمانم
هەموو کتێبە خوێناوییەکانتم خوێندنەوە
گوێم لە سەمفۆنیا و
نرکە و ناڵەی
هەموو کاتژمێرەکان و
وەرزەکان و سەدەکانت ڕاگرت

ئەوەی بینیم
هەر کۆڕەو و ڕاکردنە
هەر ئاشبەتاڵ و کەوتنە
هەرگۆڕستان و مردنە
دووبارەو دووبارە دەبنەوە
هەر جەنگی نێوان
پەنجەکان و دەستەکان و براکانە
دووبارە و دووبارە دەبنەوە
دەزانم نیشتیمانم
ئێستا تۆش
وەک من تەنیای
وەک ئاگر بێهوودەی
وەک گەردەلوول و بروسکەش نائارام
وەک مێژووشم پڕی لە زام

# (ئەوبەر تەلبەندەکانی تەنیایی)

بۆ ڕۆحی پەبوولەیی دایکم

١

گوڵەباغم
لێرەبەدوا
هەموو بەیانیانێک
ڤایبەرەکەت بکەرەوە
پەیامێک یان وێنەیەکی
بزە گەرمەکان و
نیگا سپییەکانی خۆتم
بۆ بنێرە

زێتر سەرقاڵم بکە بە خۆت
تاکو منیش ئەم ژیانەم جێبهێڵم
بە تاقی تەنێ
بڕۆمە ئەوبەر تەلبەندەکانی تەنیاییم
با لەوێدا
خۆم لەبیر بکەم و
هەموو شتێکم بیربچێتەوە
بیر لەهیچ کەسێک نەکەمەوە
گوڵەباغم تەنانەت تۆش
بەس دایکم نا ...!

۲

لەم بەستەڵەکی
غوربەت و تەنیاییەم
شانەکانی جەستە و ڕۆحم
هێندە ساردن
گوڵەباغم
نەک باوەشی تۆ
بە ئاگری دۆزەخیش
گەرم نابنەوە ...!

## ٣

دڵم هێندە بچووک بۆتەوە
حەزدەکەم
بڕۆمە نێو جەنگەڵستانێکی تاریک
تاریک تاریک تاریک

تاریک / وەک شەوەکانی
ئەوبەر تەلبەندەکانی تەنیاییم
لەوێندەرێ
لەنێو ئەشکەوتێک
بە تاقی تەنێ
بۆ خۆم ڕابکشێم
سەد ساڵیتر
لەنێو منداڵدانی هەمان دایک و
لە نێو باوەشی هەمان نیشتیمانم
چاوهەڵبێنمەوە و
دووبارە
بگەڕێمەوە نێو ژیانەوە ...!

**٢٧ی دیسەمبەری ٢٠١٧**

## (نیشتیمانم لە تەنیشت منەوە بنێژن)

نەوڕەسی من
ئەی هاودەم و هاودیدەکەی من
بەرلەوەی دوا قومی جگەرەی تەمەن و
دوا پێکی شەڕابی ئومێدەکانم هەڵبدەم
بەرلەوەی
وەسییەتەکانی خۆم
لەنێو کتێبی دڵۆپە بارانێک بنووسمەوە
بە پەیژەکانی ئاسمان هەڵگەڕێ
بڕۆ / لەبنار کێوێکی سەخت و دوورەدەستی
نێو ناوجە شاخاوییەکانی خۆرەتاو

بۆ خۆم و خۆت
کەپرێک
یان کەلاوەیەک بدۆزەرەوە
با ئەگەر بۆ ساتێکیش بێت
لە ژێر تەوژمی تاڤگەکانی
ئەم دڵەڕاوکێیە و نائومێدییەمان
دوور بکەوینەوە
بڕۆ ئەی نەوڕەسی من بڕۆ
بەرلەوەی
دوادێری ئەم قەسیدەیەم بنووسمەوە
یان دوا نوختە بۆ ( دەقی تەمەن ) م دابنێم
یان دوا پیاسە بەنێو شەقامەکانی
مردنی خۆمدا بکەم

یان بۆ دواجار
گوێ لە گۆرانییە حەزینەکانی ڕەشەبا بگرم
یان هەڵوەرینی دواهەمین
پەرەمووچەی باڵەکانی پەرەسێلکە بێنازەکان
هەڵوەرینی گەڵای دواهەمین
درەختی خەونە گەورەکانم ببینم
بە پەیژەکانی ئاسمان هەڵگەڕێ و
بڕۆ /
لەسەر دوورترین ئەستێرە
لەنێو دڵی کاتژمێر و سەوزاییە سەرمەستەکان
ئارامگەیەک بدۆزەرەوە
لەوێدا /
نیشتیمانم لە تەنیشت منەوە بنێژە

بەدیوی سەرەوەی جەستەی نیشتیمانم
لە نێو کتێبێکی بەرگ سپی
بە قەڵەمێکی ڕەشەوە / بنووسە
ئەوە نیشتیمانێک بوو
بەر لە سەدەکانی مێژوو
بەر لەسەدەکانی مەسیحەوە
هەر لە خاچ دەدرا
ئەوە نیشتیمانێک بوو
بستێک لە جەستەی نەمابوو برین نەبێ و
بە ئەندازەی هەموو ئۆقیانووسەکانی خودا
خوێن لە جەستەی دەچۆڕا
نەوڕەسەکەم
هەر لەنێو ئەم کتێبەدا / بنووسە

ئەوە نیشتیمانێک بوو
لەنێو مردندا هەناسەی دەدا و
هەر لەنێو مردنیش خەونی دەبینی
ئەوە نیشتیمانێک بوو
بۆ هەمیشەو هەمیشە و هەمیشە
لەسەر دەستی
پیاوە بچووکەکانی نێو دنیای سیاسەت
لەنێو بازارەکانی
عەرەب و تورک و عەجەم
هەڕاج دەکرا
نیشتیمانێکی بێ شوناس و بێ ئاڵا
نیشتیمانێک / بێ خودان و بێ پشتوپەنا
بڕۆ ئەی نەوڕەسی من زووکە بڕۆ

بەرلەوەی بەرەبەیانی ئەو تەنیاییەم
لەنێو شەوەکانمدا نەزیف ببێ و
ڕەنگە دڵگەشەکانی پایز
لەنێو ئەلبووم و
نیگارەکانی سروشت کاڵببنەوە
یان / ژیان مۆمی بیست و دووهەمین
سەدەی مردنی خۆی هەڵبکا
یان بەرلەوەی
میلی کاتژمێری پەلکەزێڕینە غەمگینەکان
بگاتە سەر بیست و پێنجی خۆکوشتن
دەی نەوڕەسی من / دەزووکە دەی
بەرلەوەی شەپۆلەکانی یاخیبوون
لەسەر لوتکە و گردەکانی سەرسینگی ئاو
بەچۆک دابێن

یان تریفەی مانگ
بە زمانی تاریکی سروودەکانی بچڕێ
ڕووبارەکان میلۆدییەکانی عەشقییان بیر بچێتەوە
گەردەلوول بە ئیفلیجی خول بخواتەوە و
خۆرەتاویش بەسەرخۆشی
نێولەپ و نێو نیگای خەونەکانمان بخوێنێتەوە
بڕۆ بڕۆ بڕۆ / نەوڕەسەکەم بڕۆ
بە پەیژەکانی ئاسمان هەڵگەڕێ
لەنێو پێدەشتی هەورە دوورەکان و
ئاقارە ئاوریشمییەکانی
نێو بروسکە و تەمە سپییەکاندا
لەوێدا /
لەنێو کیشوەرە ئاگراوییەکانی

دوورترین دۆزەخدا
ئارامگەیەک بدۆزەرەوە
نیشتیمانم لە تەنیشت منەوە بنێژە
لەسەر کێلەکەشی بنووسە
نیشتیمانی چلوپێنج ملیۆن مرۆڤی ونبوو
پێنج هەزار ئەستێرەی ڕژاو
هەزاران هەزار باڵندەی سەربڕاو
( سەدو هەشتاو دوو هەزار ) پەپوولەی ئەنفال
نیشتیمانێکی بێ شوناس و بێ ئاڵا
نیشتیمانێک / بێ خودان و بێ پشتوپەنا
نیشتیمانێک لەنێو هەموو
سەدەکان و وەرزەکان و ساڵەکان و
مانگەکان و ڕۆژەکانیدا

بەرەبەیانێکی ڕوون
پرشنگی نەداو نەدرەوشایەوە
لەنێو شەوە سوور و سپی و شینەکانیدا
نافوورەیەکی ئازادی
بەبنار مەمکۆڵەکانییەوە
فەوارەی نەداو نەبریسکایەوە
نیشتیمانێکی ماندوو
ماندوو ماندوو ماندوو
لێیگەڕێن
با چاوە گەشە پرشنگییەکانی لەسەریەک دابنێ و
با بە بەرینایی جەستەی خۆی
لەنێو گۆڕەکەیدا ڕابکشێ و بحەسێتەوە

منیش هەرلەوێدا
لەنێو ئەم ئارامگە ڕووناکەدا
هەروەکجاران
لاوکەکانی تەنیایی و
لاوژەکانی هەرەس و
سەدای سووتماکی سووتانەکان و
نرکە و ناڵە پڕ حەسرەتییەکان و
خەونە خاکییە خەزانییەکانی
خۆم و نیشتیمانم
لەنێو قەسیدەیەکی درێژدا
بۆ ئێوەی وەک من مردوو
بە ڕێنووسە /
نارنجییەکانی نائومێدی / دەنووسمەوە ...!

**بەفرانباری ٢٠١٨**

# (عەفرین ئاڤێستایە)

## ١

( عەفرین )
ع / ڕەمزی عەدالەت و
ە / ڕەمزی ئاڤێستای دڵگەش و
ف / ڕەمزی فڕین و
ر / ڕەمزی ڕاز و
ی / ڕەمزی یەکسانی و
ن / ڕەمزی نەکەوتنە

٢

( ئاڤێستا )

ێ / ئەوینێک بڵندتر لە بەرزاییەکانی ئاسمان

ئاوێزان لەگەڵ ئازادی

ئاڵوودە لەگەڵ عەشق و خاک و ئەبەدییەت

ا / ئارام ئارام
ئاگری لە تخوبەکانی نێوان مردن و ژیان بەردا
لەنێو تابلۆیەکی پایزی
سەمای لەگەڵ درەختە هەڵوەریوەکان و
باڵندە نامرادەکان دابەستا
ڤ / ڤژاندنی ڕەنگە ئیرۆسییەکانی ئاگر و
دەستپێکردنەوەی سرووده نەرمەکانی باران
ێ / ئێشکگر و شەباهەنگی شکۆی نیشتیمان
پرژاندنی شیلەی گەشبوونەوە
بەسەر درەخت و پنجە گیا و سەوزایی باخچەکان
س/ سەوداسەر و سەرمەست و سەرمەدی
سولاڤێک نم نم
دەڕژێتە نێو ئەفسانە و کتێبە پیرۆزەکانی سەروەری
ت / تەمتوومانێکی سپی
تارایەکی سوور
تاڤگەیەکی ئاوس بە ژان و میلۆدییەکانی ئەڤینی
ا / ئاڤێستا و ئاڤێستا و ئاڤێستا
چڵە زەیتوونە چاوگەشەکەی عەفرینم
ئەی داستانی هێلە شینەکانی نێوان ڕەشبوونەوە و درەوشانەوە
ئەی تۆفانی نەبەردبوون و پشکوتن و ژیانەوە

## ٣

عەفرین ئاڤێستایە
ئاڤێستاش ڕووناکییە و ڕاچڵەکینە و ڕێگایە
عەفرین /ماڵێک بۆ خۆشەویستی و پێکەوە ژیان
ئاڤێستاش / لوتکەیەک بۆ سەروەری و بەرخودان
سومبولێک بۆ بوون ، شەهێنێک بۆ شوناس
خورپەیەک بۆ خۆرەتاوی نێو خەونە خۆڕسکەکان
عەفرین ئاڤێستایە
ئاڤێستاش / ئاگردانێک پڕ لە پشکۆ
شەپۆلێک پڕ لە شکۆ / هێشوویەک پڕ لە هاوار
دەنگێکی دڵگوشاد پڕ لە داد و دلێری و دلۆڤان
ئاڤێستا و ئاڤێستا و ئاڤێستا
هێمایەک / بۆ هەرمان و ئایندە و نیشتیمان ...!

تێبینی / ڤژاندن یانی بووژاندنەوە .

٢٩ی بەفرانباری ٢٠١٨

# من سییەکانم پڕن لە بۆنی ڕەیحانە

ڕۆژگارێک لە نێو
شەوە درێژەکانی کەنار ترۆپکی باکووری غەریبی
شەوە ونبووەکانی نێو ڕێڕەوەکانی تاریکی
تاریکییە ونبووەکانی نێو کۆڵانە پێچاوپێچەکانی تەنیایی
کاتژمێرێکیش بە بێدەنگی
لەنێو بێدەنگی / شەوەکان و شەپۆلەکان و شەونمەکاندا
نێولەپی عەشقێک دەخوێنێتەوە
عەشقێک کە بەتاقی تەنیا
لەکەنار ترۆپکی باکووری غەریبی
لە ژوورێکی جۆلوهۆڵ
لە باوەشی بێئۆقرەیی ڕاکشاوەو

تنۆک تنۆک تەنیایی لێدەڕژێ
منیش لەنێو ئەو شەوە درێژەدا وا هەستدەکەم
قورسایی هەموو /
زەمەنەکان و کاتژمێرەکان و سەدە ڕۆیشتووەکان
بەسەر شانمەوەیە
وا هەستدەکەم / لەنێو فارغۆنێکی بەتاڵی نێو میترۆیەکدام
هەردەڕۆم و ناگەم بە هیچ
منیش / لەم سەهۆڵبەندانی ئەم مردنە هێواشەم
بە بێدەنگی وەکو بەرد بیر لەتۆ دەکەمەوە
تۆش وەرە / ئەی وردە خۆرەتاوی نێو چاوەکانی تاریکی
ئەی شنەبایە گەرمەکەی نێو هەناسە سپییەکانی بەفر
ئەی تریفە غەمگینەکانی نێو شەوە درێژەکانی
کەنار ترۆپکی باکووری مردن
من سییەکانم پڕن لە بۆنی ڕەیحانە

## ٢

وەرە خۆت و سەبەتەیەک پڕ لە ئەستێرە
خۆت و خەونێک پڕ لە بروسکە
لەسەر نێو لەپی خەیاڵەکانت
چیرۆکی برینەکان و
ئایەتە دڵتەنگییەکانی خاکم بۆ بنووسەوە
پەنجەکانت لەنێولەپی مندا بخشێنە
با خەم و خەون و خۆزگەکانت
کۆپی بن لەنێو مندا
با ڕووناکی چاوەکانت بێنە نێو تریفەی تەنیایی من
زەردەخەنە نەرمەکانیشت
وەک لاولاوە لە جەستەم بئاڵێن
وەرە لێوت لەسەر لێوەکانم دابنێ
بە گەڵا ئەوینییەکانی خۆت دامپۆشە

وەرە بمبەرەوە
لەنێو ئاگردانی ئارەزووەکانت و
لەنێو خەونی خۆرەتاو و
لەنێو مەمکۆڵەکانی نیشتیمانم / لەخاچمدە
دەوەرە دەی
من سییەکانم پڕن لەبۆنی ڕەیحانە

## ٣

ئەی شازادەی شەوەکان و
شەباهەنگە شلێرییەکەی من / بگەڕێوە
با مەودا دوورەکانی نێوانمان
لەنێو دەفتەری چارەنووس و
لەسەر نەخشەکانی عەشق بسڕینەوە
بگەڕێوە و ڕووی خۆت بەرەو ڕووناکی وەرگێڕە
بێ سلەمینەوە لە سەردەمە سەرسەرییەکانی مردن

لە ڕۆژە ڕەشەکانی ڕابردوو
لە ئاگرە سۆزانییەکانی دۆزەخ
بگەڕێوە و بازبدە
بەسەر پشتی تیشکە یاخییەکانی شەو
حیکایەتی نەهەنگە پیرەکان لەبیرخۆت بەرەوە
بگەڕێوە / با چیتر
عەشق لەنێو کاتژمێرە بەسەرچووەکاندا / نەزیف نەبێ
با ژیان لەنێو خەونەکانی نیشتیمان و
نیشتیمان لەنێو خەونەکانی ژیان / چاو هەڵبێنێتەوە
بگەڕێوە منیش لە چاوەڕوانیت
وەک ئاگر لە زیکر و
وەک خاڵخاڵۆکە لە خەڵوەت و
وەک نەورەس لە فڕیندام
دەبگەڕێوە دەی
من سییەکانم پڕن لە بۆنی ڕەیحانە

٤

تۆش لە چاوەڕوانیم بە ئەی شۆخ
منیش بۆ ئەوینی تۆ دەگەڕێمەوە نێو ژیان
دێمەوە و وەک دڵۆپە شەونمێک
بەسەر پەنجەرەکانی نائومێدی دێمەخوارەوە
وەک دڵۆپە بارانێک
بەنێو قژی عەشق و بەنێو دڵی خاکدا
شل شل شۆڕدەبمەوە
دێمەوە بەنێو ڕابردووی ڕازەکان و
بەنێو ڕازە ڕابردووەکاندا ڕەتدەبم
مۆمی نێو
ئاوێنە ئەستێرەییەکانی ئاییندە / دادەگیرسێنمەوە
وەک پنجە گیایەک
سەردەردێنمەوە
لەنێو پێدەشتەکانی پرسیار و گەردانەکانی گومان

لەژێر خیوەتەکانی خۆشەویستیش ڕادەکشێمەوە
تۆش نەرم نەرم
بە پەیژەی نهۆمی نائومێدییەکانم هەڵگەڕێ
لەنێو خەونە بێدارییەکانم بمێنەرەوە
بمێنەرەوە و دوور بڕوانە دوور دوور
بمێنەرەوە و بفڕە بەنێو / قووڵاییەکانی هەور و
قووڵاییەکانی مانگ و قووڵاییەکانی کات

بفرە بەنێو /
گەردەلوولەکانی گومان و نەسیمە نائومێدییەکانی من
بفرە بەنێو خەونە خاپووربووەکانی خۆشەویستیم
نزیکبەرەوە لێم / نزیک نزیک نزیک
وەک نزیکی /
من و تەنیایی و
وەک نزیکی
من و مردن

وەک نزیکی
من و نیشتیمان
گوڵەگیانم نزیکبەرەوە لێم
نزیک نزیک نزیک
من سییەکانم پڕن لە بۆنی ڕەیحانە

٥

ئەی فریشتە پەڕوباڵسپییەکەی عەشق
من ماندووم
وەرە دوورم خەرەوە
لە تۆز و غوبارە غەمگینەکانی غوربەت و
لە شەپۆلە شینەکانی شێتبوون و
لە خەیاڵە خواروخێچەکانی خۆکوشتن

دوورم خەرەوە دوور
لە تەلبەندە تاریک تاریکەکانی تەنیایی
بمگەڕێنەوە نێو ئاوێنە ئەوینییەکەی خۆت
با لەوێندەرێ
منداڵان لەگەڵ پێکەنین و
عاشقەکان لەگەڵ سەما و
مرۆڤەکان لەگەڵ میهر / ئاشتکەینەوە
با مەوداکانی سەرەتا و کۆتاییەکانی خەون
لەیەکتری نزیک بکەینەوە
ژیان لەگەڵ ئازادی و ئازادی لەگەڵ ژیان
عەشق لەگەڵ شیعر و شیعر لەگەڵ عەشق
تەنیایی لەگەڵ ئومێد و ئومێد لەگەڵ تەنیایی / ئاشتکەینەوە
وەرە بمبە لەنێو ئاوێنە ئەوینییەکەی خۆت
بوونم بڕازێنەوە
بە ڕەنگە ڕووناکەکانی خۆت

به‌ هه‌سته‌ هێڤییه‌کانی خۆت
به‌ سۆزه‌ سه‌رمه‌دییه‌کانی خۆت
وه‌ره‌ و ببه‌
بارانه‌ به‌رائه‌تییه‌کانی خۆت
ببارێنه‌ به‌سه‌ر جه‌سته‌ی خۆڵه‌مێشیم
بێدارمکه‌ره‌وه‌ / له‌نێو نائومێدییه‌ نه‌رمه‌کانی نه‌بوون
به‌ ئه‌وینی نێو ئاوێنه‌ ئه‌به‌دییه‌که‌ی خۆت
بێدارمکه‌ره‌وه‌ / له‌نێو خه‌یاڵه‌ خرپنه‌کانی وه‌هم
به‌ ئاگره‌ ئیرۆسییه‌ ئه‌زه‌لییه‌کانی خۆت
بێدارمکه‌ره‌وه‌ / له‌نێو ئه‌شکه‌وته‌ تاریکه‌کانی مردن
ده‌وه‌ره‌ ده‌ی
من له‌تاو تامه‌زرۆیی تۆ و
تاسه‌ گه‌رمه‌کانی نیشتیمانم
سییه‌کانم پڕن له‌ بۆنی ڕه‌یحانه‌

## ٦

بە بێدەنگی
لەژێر میلی کاتژمێرەکانی تەمەن ڕاکشاوم
ڕۆژەکان و مانگەکان و ساڵەکانم
ڕەتدەبن
پایزیش جارجارە
بە زەردەخەنەیەکی خەمناکەوە
بزەیەکم بۆ دەکات و دەڵێت
هاوڕێم دیسان وەرزێکی ترە و هیچی تر
چ ئافاتێکی بێهوودەیە
کاتێک عەشق دەلاقەیەکی پێ نەبێت
بۆ کتێبی خەونە سپییە ئیرۆسییەکانمان
ڕووبار سەمفۆنیایەکی پێ نەبێت
بۆ ئارامبوونەوەی ڕۆحە برینندارە ماندووەکانمان

بەهار بوخچەیەکی پینەبێت
بۆ ڕەنگە ناسکە نائومێدییەکانمان
لەولاوەش مانگی بەفرانبار
لە یاداشتنامەکانی خۆی دەنووسێت و دەڵێت
هاوڕێم تەنها ساڵێکی ترە و هیچی تر
چ ئافاتێکی ئاگرینە
کاتێک ژیان بوخچەیەکی پێ نەبێت
بۆ وردە ئومێدە پەمەییەکان
خۆرەتاو پەنجەرەی تیشکەکانی خۆی
بەڕووی شەوەکانی نیشتیمانی من دابخات
ئاسمان ڕووبەرێکی نەبێت
بۆ فڕینی پەپوولە ونبووە بێ شووناسەکان
کازێوەش لەنێو فرمێسکەکانی خۆی
مەسیجێک جێبهێڵێ و بڵێت
هاوڕێم تەنها ڕۆژێکی ترەو هیچی تر

منیش لە کەناری ترۆپکی باکووری ئەم غەریبییەم
سییەکانم پڕن لە بۆنی ڕەیحانە

٧

با بە پێخاوسی بەسەر وردە شووشەکانی عەشقدا بڕۆین
با خوێنە ڕەشەکان
لە جەستەمان جیا ببنەوە
با بە پێخاوسی بەسەر بەفردا بڕۆین
تا لە خەونە گەرمەکانی خاک نزیک ببینەوە
با بە پێخاوسی بەنێو ئاگردا بڕۆین
تا پاکبینەوە و
بگەڕێینەوە نێو ئاوێنە ئەوینییە ئەبەدەییەکان
با لەنێو ئۆقیانووسی خەیاڵەکانمان
وێنەی بەهەشتێکی تر بکێشین

بەهەشتێک /
پڕ بێت لە هەناسە
پڕ بێت لە سەما
پڕ بێت لە ژیان
با قوفلی دەورەی بازنەکانی
پرسیارەکان و نیگاکان و خەونەکان و
هاوارەکان و ئارەزووەکانمان / بکەینەوە
با خۆرەتاو لەنێو ماڵەکانمانەوە هەڵبێ
با شیلەی شەرم و نائومێدییەکان
تک تک بڕژێنە نێو تاریکی
تا وشکبوونەوە و ڕووتبوونەوەی ڕۆح
با لەژێر نەرمە ڕێژنەی بارانی بەهارێکی تر
خۆمان تەڕ بکەینەوە
منیش / لە چاوەڕوانی ئەم کەرنەڤاڵە ڕەنگینەدا

لە دووری دوورەوە
لە کەناری ترۆپکی باکووری غەریبی
لەنێو قووڵایی تەنیایی خۆم
سییەکانم پڕن لە بۆنی ڕەیحانە ...!

**تەمووزی ٢٠١٨**

# (نیشتیمان و یادەوەرییەکانی غوربەت)

نیشتیمان ماڵ و ژیانمانە
من کە نیشتیمانم خۆشدەوێ و
شیعری بۆ دەنووسم
منەت بەسەر خاکِ و قەڵەمەکەم و
منەت بەسەر هیچ کەسێکەوە ناکەم
ئاخر گوڵەباغم
گەر نیشتیمانمان نەبێت
لە کوێ ماڵێک بدۆزینەوە بۆ بەیەکەوەبوون
کە ماڵێکمان نەبێت
لە کوێ ژوورێک دروست بکەین بۆ نووستن

کە ژووری نووستنێکمان نەبێت
لە کوێ سیسەمێک دابنێین
بۆ ئاوێزانبوون و خەون بینین
لە کوێ پەروانەیەک هەڵبکەین
بۆ گەشبوونەوەی
پشکۆی پرسیارە پەنهانەکانمان
لە کوێ تابلۆی
خەونە جوانەمەرگبووەکانی من و
یان / تابلۆی
جوانییەکانی مەرگی خەونەکانی تۆ / هەڵبواسین
لەسەر کام دیوار
نیگاری
تەنیاییە ئافاتییە غوربەتییەکانی من و
یان / نیگاری
ئافاتە غوربەتیەکانی تەنیایی تۆ / بنەخشێنین

لەسەر تاتەشۆری کام کانی
ئایەتە ئیرۆسییەکانمان بخوێنین
خوێنی خەونەکانمان تێکەڵ بەیەکبکەین و
نوێژێک بۆ ئەم عەشقە ئەبەدییەمان / دابەستین
بۆنی خۆڵی پاشبارانی
کام پێدەشت و کام گوندو لادێی
نیو مەمکۆڵە نامورادەکانی
کام لە ئومێدەکانمان / هەڵبمژین
ئەی /
بارانی کام شوناس و کام شکۆ
برینەکانمان سارێژ بکات و بوونمان / بڕازێنێتەوە
دە بیرکەرەوە گوڵی من
کە نیشتیمانێکمان نەبێت
لە کوێ پەنجەرەیەک بدۆزینەوە بۆ ڕوانین

ڕووبارێک بۆ ڕازەکان
سەکۆیەک بۆ سەما
هەیوانێک بۆ هیواکان
ئاسمانێک بۆ فڕین
ژێر درەختێک بۆ ژووان
شەقامێک بۆ پیاسە
گوڵە گیانم
باخچەیەکیش بۆ عەشق ...!

**پاییزی ٢٠١٧**

# (شەونمە شینەکانی شەو)

تۆ دڵۆپە شەونمێکی
بەسەر لێوی گوڵێکی شینەوە
شین دەچییەوە
زەردەخەنەی باخچەکانیش
بە تیشکی سەر ڕوخساری تۆ دەبریسکێنەوە
هەندێجاریش / نەرم نەرم
بەسەر ڕووی پەنجەرەیەک دێیتە خوارێ
کە بە پەردەیەکی شین داپۆشراوە
لە دیوی ژوورەوەش
ژنە نەوڕەسییەکی نامۆراد
بە ژێرکراسێکی تەنکەوە

لەسەر سیسەمەکەی ڕاکشاوە
مۆمێکی داگیرساندووە و شیعر دەخوێنێتەوە
تۆ تریفەی مانگێکی شینی
لە نێو تاریکی شەو و
بەسەر تاشەبەردەکانی تەمەنم
دەدرەوشێیەوە
بە بوونی تۆ
هەموو / شەونمە شادومانییەکانی شەو و
نیگای سنەوبەرەکان و شەپۆلی دەریاکان و
ڕەشماڵی کەنار بنارەکان / شین دەچنەوە
تۆ /
کتێبی خەونەکانمت پڕ بارانی شین و
دەفتەری شیعرەکانم پڕ شیعری شین و
بوخچەی ئارەزووەکانیشم
پڕ وردە کانیاوی شین کردووە

لە شەوێکی شین شینی پایزیش
وەکو شیلە
شل شل
دەڕژێیتە نێو پێدەشتی
خەیاڵە شینەکانی من
شەوئمی شین و شەوی شین
تاڤگەی شین و توانەوەی شین
عەشقی شین و شیعری شین
شین شین وەک دەریا
شین شین وەک ئاگر
شین شین وەک خودا
تۆ تەونێکی لە شەوە شینەکاندا
ڕۆحی ئەستێرە دوورەکان و
شەوئمە ئیرۆسییەکان و
پەپوولە یاخییەکان

بە ڕۆحی من دەبەستییەوە
تۆ قەڵەمێکی
هەوری نێو شەوە شینەکانت لەخۆت لوولداوە
بە مەرەکەبی بارانە شینەکانیش
شیعری عاشقانە
لەسەر ڕووی ڕووبارەکان و دەریاکان
دەنووسییەوە
گوڵەگیانم
تۆ دڵۆپە شەونمێکی سەر گۆنای
خونچەیەکی شینی شەبەنگی
نێو تەمە سپییەکانیت
لەسەرەتای سەرەتاکانەوە هاتوویت
بەنێو کۆتایی کۆتاییەکانیش / تێپەڕیویت
کاتژمێرەکان بە هەناسەی تۆ بێدار دەبنەوە
زەمەنیش درێژە بە وەرز و سەدەکانی خۆی دەدات

تۆ سومبولێکی سەرمەدیت
دەبیت بە باران و تێکەڵ بەخاک دەبیت
دەبیت بەخاک و خۆت بۆ بەفر ڕووت دەکەیتەوە
هەموو بەرەبەیانێکیش
ئەو کاتانەی
پرشنگی خۆرەتاو
لێوی لە لێوە شینەکانت دەخشێنێ
وەرزە تاریکەکانی عەشق و
ئەشکەوتە تاریکەکانی تەنیایی و
بەهەشتە تاریکەکانی مردن
ڕووناک دەکەیتەوە
مەمکۆڵە گەرمەکانیشت
شەوە شینەکانی
نێو قەسیدە درێژەکانی غوربەتم
گەرم دەکەنەوە

وەک شلکە ڕێواسێکی ناسکیش
نێودەمی
زورگە وشکهەڵاتووەکانی خەیاڵم و
کێڵگەی ئارەزووەکانم / تەڕدەکەیتەوە ...!

ئابی ٢٠١٨

# (با بەدەم خۆرئاوابوونەوە ئاواببین)

لەم زەمەنە زەندەقچووە زریاناوییە
ژیان چیرۆکی مردنی خۆی
بە بێدەنگی
بە قەڵەمێکی سپی
لەژێر سێبەری دارسنەوبەرێک
دەنووسێتەوەو ئاوا دەبێ
ژنەکان نائومێدانە
بەرێنووسە خۆڵەمێشییەکانی خەفەت
خەونە سەربڕاوەکانی خۆیان
لەنێو دڵۆپە بارانەکان
دەنووسنەوەو ئاوادەبن

هەور هەگبەی هیواکانی خۆی
بە پەلکەزێڕینە
دەسپێرێ و ئاوادەبێ
ڕووناکی / ڕازە ڕەونەقاوییەکانی خۆی
لەنێو قووڵایی ڕووبارەکان
جێدەهێڵێ و ئاوادەبێ
کاتژمێرە خەواڵووەکان
بە دەوری
بازنە خواروخێچەکانی خۆیان
دەسووڕێنەوە و ئاوادەبن
تریفە و تەم / تاو تاو
دووردەکەونەوە و ئاوادەبن
ڕۆژەکان و ساڵەکان و سەدەکان
وەکو گەڵا
بەنێو بادا پەرشوبڵاو دەبنەوە

ورد ورد
وندەبن و ئاوادەبن
من و تۆش
لەنێو
سەودا سەرییەکانی سەفەر و
نەغمە غەمگینەکانی غوربەتدا
غەرقبووین
نامرادانە نەمانتوانی
دوابەشی قەسیدەکانی عەشق
بنووسینەوە
ئیدی لەم سەردەمە
سەرابییە سەرمەستییەی
ونبوون و ئاوابوونەدا
کاتێک /
خاک و خولیاکان

ئایندە و ئارەزووەکان
شکۆ و شوناسەکان
دەبن /
بە پایزێک لە تۆز و غوبار
دەی /
دەبا من و تۆش
بە بێدەنگی
هێمن هێمن
لە ئێوارەیەکی هەناری ادا
ببین بە هەڵم و
بە دەم خۆرئاوابوونەوە / ئاوابیین ...!

ئۆکتۆبەری ٢٠١٨

# (باڵایەک ڕەنگینتر لە گوڵ)

(قەسیدەیەکی تەواو نەکراو)
پشووبە ئەی شۆخ
پەنجەکانت ماندوو بوون
بە ژەنینی ئەو پیانۆیەی
کە ئاوازە غەمگینەکانی نائومێدی دەژەنێت
چاوەکانت ماندوو بوون
لە خوێندنەوەی کتێبی
جەنگەکان و کوشتنەکان و مردنەکان
مەمکەکانت ماندوو بوون
لەنێو وەرزە درێژەکانی چاوەڕوانی
بگەڕێوە ئەی شۆخ
خەونەکانت پیر بوون

بە ئەوسەری ڕێگا تاریکەکانی نەگەیشتن
وەک من/ لەنێو مەملەکەتی بۆشاییدا
هەر دەڕۆیت و
لە هیچ شوێنێ
لەژێر کەپرێک ناگیرسێیتەوە
ئەی موسافیرە نامرادەکەم
بگەڕێوە و
لە کەنارەکانی ژیان
لە پەنا تاشە بەردەکانی بێهوودەیی
مرۆڤێک
لە چاوەڕوانیت
لە نێو بەلەمەکانی نائومێدی
حیکایەتەکانی تەنیاییت دەنووسێتەوە
شاعیرێک لەنێو خەونەکانتدا

سوورێتی شەوەکانت
سپێتی نیگاکانت
شینێتی خەونەکانت
ڕەشێتی ئومێدەکانت
زەردێتی ڕازەکانت
لە قەسیدەکدا دەنووسێتەوە
ئەی شۆخ
ئەی باڵا ڕەنگینتر لە گوڵ
ئەفسوونتر لە پەرییەکانی خودا
من و تۆ قەدەرمان وایە و
هەر دەبێ لە بۆشایی
نێو ئاسمانی ئەستێرەکی تەنیا
بە ئاراستەی پێچەوانەی یەکتر
هەر بسووڕێینەوە ..!

## ( سروودێک بۆ شیلادزێ )

شیلەیەکی ئاگرین بوو
لە کانی خەونەکانمانەوە دەربوو
تۆفانێکی تووڕەیی بوو
لە تونێلی برینەکانمانەوە دەرچوو

بروسکەیەکی ئومێد بوو
کۆشکی فاشیستەکانی هەژاند
لافاوی فرمێسکی نیشتیمانم بوو
شوورەی داگیرکارانی لەرزاند

پەیامێکی پەنگخواردوو بوو
دۆزەخی بۆ زۆرداران خوڵقاند
وەڵامێکی دەمشکێن بوو
زریکەی لە دوژمن هەستاند

بەفرانباری ٢٠١٩

# (گەریدەیەک ماندووتر لە گەردەلوول)

**بۆ / مام حەمەد شێخەشەلی**

تۆ گەریدەیەک بووی لە جنسی با
نیشتیمانێک بووی پڕ لە خەون
کتێبێک بووی پڕ لە هیوا
لەو ڕۆژەوەی هاتییە.دنیا
وەکو ڕووبار دەمت بۆ باران و
وەک سپیدەش
باوەشت بۆ خۆرەتاو دەکردەوە
گەریدەیەک / ماندووتر لە گەردەلوول
ئۆقیانووسێک / بێهودەتر لە هەور

زریانێک / بێئارامتر لە بروسکە
وەک تریفەی مانگ
بێحەسانەوە
گوند بە گوند و
شاخ بە شاخ و
ماڵ بە ماڵ
هەموو شوێنێکت بەسەر دەکردەوە
وەک درەختیش
ڕەگت بەنێو قووڵایی خاک داکوتابوو
ئاسۆی ئومێدەکانیشت
وەک پرشنگی بەیانییان
ڕوون ڕوون دەدرەوشایەوە
تۆ مەشخەڵێکی پڕ بڵێسە و
ئاگرە سوورەکەی شۆڕش بووی

داگیرسایت و نەکوژایتەوە
لە بەرامبەر قەڵای ستەم و زۆرداریش
سەفین و پیرەمەگروون بووی
بۆ تەنها جارێکیش نەچەمایتەوە
تۆ هەڵۆیەکی بێئۆقرە بووی
لەگەڵ فرمێسکی
سەر ڕوخساری هەر منداڵێکی کورد
لەنێو فرینەکانتدا ژانت دەگرت
لەگەڵ دڵۆپە خوێنی هەر پێشمەرگەیەک
لەنێو خەونەکانتدا نەزیف دەبووی
لەگەڵ سووتاندنی هەر ڕەز و باخێک
لەنێو خەیاڵەکانتدا دەسووتای
لەگەڵ هەڵمەت و تۆڵەسەندنەوە بە زەبرەکانیش
زیندوو دەبوویتەوە و باڵت دەگرت

تۆ ئەستێرەیەکی پرشنگدار بووی
لە نێو تاریکایی هەموو شەوێک دەردەکەوتی
لە ڕۆژە سەختە خوێناوییەکاندا
بەسەر پشتی شەپۆلەکانی مەرگ
بازت دەدا و نەدەکەوتی
مردنیش وەکو سێبەرێک
هەر بەدواتەوە بوو
بەردەوامیش
کونجە تاریکەکانی زیندان
وێستگەی پشوودان و ماڵی دووەمت بوو
ئەی گەریدە ماندوو نەناسەکەم
سروشت گۆڕا تۆ نەگۆڕای
زەمەن گۆڕا تۆ نەگۆڕای
ئاسمان گۆڕا تۆ نەگۆڕای
بە هەمان میلۆدی و

هەمان ورە و
هەمان ڕێچکەی کوردانەوە
وەکو بەهار / لە جاران سەوزتر
وەکو ئاگر / لە جاران سوورتر
وەکو پشکۆش لە جاران گەشتر
لە یەکەم چرکەوە تا دوا هەناسە
بە هیلاکی و بە برسییەتی
هەر کوردستانی و
هەر نیشتیمانی و هەر یەکێتی
ئەی مامۆستام
ساڵ سەرەتای هەشتاکان بوو
ژیان لەناو مردن هەناسەی دەدا
لە ڕۆژگارە سەختە ترسناکەکاندا
لەسەر دەستی تۆدا

من بە ڕیزەکانی
کۆمەڵەی ڕەنجدەرانەوە پەیوەست بووم
لە تۆوە فێربووم
ئازادی مرۆڤەکان ببێ بە ڕێبازم و
ڕزگاری کوردستانیش ببێ بە قیبلەم
هەر لە ڕێگەی تۆش
بە دروشمەکانی
نەسرەوتن تا سەرکەوتن و
یان / کەم ژیان و کەڵ ژیان .. ئاشنا بووم
یان ئەو ڕۆژە ئاگراوییانەی
لە نێو کەژاوەی خۆپیشاندانەکاندا
ئەو دەمەی لە دەستی
بەعسییەکان و مەرگ ڕزگارم دەبوو
خۆم دەگەیاندە ماڵەکەی تۆ

تۆش هێور و ئارامت دەکردمەوە
دووبارە گڕوو تینوو وزەت پێ دەبەخشیمەوە
ئەی مامۆستام
باشم لەبیرە
لە سەفەرێکی گەڕانەوەم بۆ نیشتیمان
هاتم بۆ لات و سەردانم کردی
دوو شەو لە گەڵتا مامەوە
تۆش / بە هەمان زەردەخەنە و
بە هەمان هەناسە و
بەهەمان دەنگ و ڕەنگەوە
یادەوەرییە شیرینەکانت
بۆم دەگێڕایەوە
دواتر لە ڕستەیەکدا گوتت

( من ئێستا سەربەرزم
نانی ماندووبوونی خۆم دەخۆم ...! )
منیش لەگەڵ ئەم قسەیەت
زنجیرەی بیرکردنەوەکانم پچڕا
بە سەرسامییەوە لە خۆم پرسی و
گوتم / ئەوە چ مرۆڤێکە ئەی خودا !؟
( چونکە هەموو نانەکەی ئەو
معاشێکی زیندانییە سیاسییەکەی بوو ...! )
بۆیە لێی ورد بوومەوە
ورد ورد ورد
لەنێو قووڵایی چاوەکانی
( ماندێلا )یەکی نەبەردی کوردم بینی
ئەی کولیکە سوورەکەی
دەشتە کاکی بەکاکییەکەی

شێخەشەڵ و بەڕانەتی
من یەقینم و دڵنیام
مرۆڤە گەورەکان
بە مردنییان جارێکی تر لە دایکدەبنەوە
دەبن بە کتێبێکی پیرۆز
لە پەرستگەکانی مێژوو
بۆ تاهەتا دەمێننەوە
ئێستا تۆش
لە باوەشی خاک ڕاکشایت و
من یەقینم و دڵنیام
لەوێندەرێش
سروودە گەرمەکانی ڕێی خەباتمان دەڵێیتەوە
لەکاتی تێنووبونا
ئاو لەنێو لەپی خۆرەتاوِ دەخۆیتەوە
بنوو بە ئارامی ئەی مامۆستام

ڕۆحت شاد و
کوردستانیش هەر ئاوەدان
تۆش تا ئەبەد
لەنێو هزر و ویژدانمان دا
سەرکەش و زیندوو دەمێنیتەوە ...!

**ئاداری ٢٠١٩**

# (ڕۆژژمێری من و تۆ)

## ١

دەمێک لەنێو مەمکۆڵە نەرمەکانی مانگ و
دەمێکیش لەبنار کێوە سەختە سەوزەکانی هەور
دەمێک لە پاڵ تەرمە پڕ برینەکانی نیشتیمان و
دەمێکیش لەنێو ئەشکەوتە شێدارەکانی دۆزەخ
دەمێک لەسەر شۆستە تاریکەکانی تەنیایی
دەمێکیش لەسەر پشتی شەپۆلە شینەکانی دەریا
دەمێک لەنێو ڕۆشنایی چاوە گەشەکانی ئەستێرە
دەمێکیش لەنێو خەیاڵە غەمگینییەکانی غوربەت
گوڵەگیانم /
هەردەڕۆم و ناگەم بەهیچ شوێن
هەر دەڕوانم و نازانم لە کوێم

بەڵام / ئەوە باشدەزانم و دڵنیام
هەموو ڕۆژەکانی تەمەنم
لەنێو گەڕەکە هەژارنشینەکانی
نێو نیگا نەرمەکان و
خەونە خەماوییەکانی تۆم
من وا لەوێم
وەک موریدێکی ئەشقیای ون
بۆ تاهەتایە / لەوێدا نیشتەجێم

## ٢

هۆ پەپوولە پاییزییەکە
زەمەن دەڕوا
تەمەن دەڕوا
تۆش لە من دوورتر دەکەوییەوە
دوور دوور دوور
دوور / وەک مەوداکانی نێوان
ژیان و نیشتیمان ..............ی....... من
خۆرەتاو و خەونەکان ...........ی........ من
ئاگر و ئەوینەکان ..................ی.........من
باران و بەهارەکان..............ی..........من
شەونم و شەوەکان............ی ......من

تا دێ منیش لە ڕۆحی تۆ نزیکتر دەبمەوە
نزیک نزیک نزیک
نزیک / وەک مەوداکانی نێوان
من و میلۆدییەکانی مردن
من و شەباهەنگەکانی شیعر
من و نیگا نەرم نەرمەکانی تۆ

٣

تۆ / نە ئاگری نە ئاگردان
نە پشکۆکانی خۆرەتاوی نە بورکان
نە کورەی نازییەکانی نە دۆزەخی خوداکان
کەچی من لەوەتەی هەم لە نێو تۆدا دەسووتێم

## ٤

وا پێدەچێ
تۆ لە جنسی تریفە بیت
منیش / پێکهاتەیەک بم
لە تۆز و غوبارەکانی تاریکی
یان تۆ / شنەبایەکی فێنکی
نێو هەناسەکانی نیشتیمان بیت و
منیش / ڕەشەبایەکی سەرشێتی
نێو پێدەشتەکانی غەریبی
بۆیە چارەنووس
هێندەی دەکات ناتوانێ
لەژێر ساباتی
کەژ و کێوەکانی عەشق
کۆمانبکاتەوە

٥

کاتژمێر چەندی بێدەنگی و
وەرزی چەندەمی نائومێدییە
سەوزایی جەستەی ژیانی بەسەرشانی داداوە و
بەرەو گۆڕستانی دەبات
دەریاش دەروازەی خۆی
بەسەر ڕووی شەپۆلەکان داخستووە
درەختەکان هەر بە چاو
چیرۆکە خەمناکەکان بۆ یەکتری دەگێڕنەوە
من و تۆش لەنێو کتێبەکانی تەنیایی
تاو تاو /
ڕۆژژمێری نەزیفبوونی
ئەم عەشقەمان دەنووسینەوە ...!

تەموزی ٢٠١٩

# (لە سێشەمەی عەشقەوە بۆ پێنجشەمەی مردن)

**( سێشەمەی عەشق )**

سێشەمەیەک /
ژیان تیایدا
توێکلە بێتامە تفتەکانی نائومێدی
فڕێدەدات و
وەکو پیفۆک سپی سپی دەردەکەوێت
سێشەمەیەک /
شەوەکان بە هەناسە و
بە تیشکە گەش گەشەکانی
نافوورە ( کەسک و سۆرەکان ) دەدرەوشێنەوە

تریفەی مانگیش لە ترۆکی تاوەرەکانەوە
مژدەی بەیانییەکی نوێ
بەیانییەکی
پڕ لە نان و پڕ لە گوڵ
بڵاودەکاتەوە
سێشەمەیەک /
هەموو دوای نیوەڕۆییەک
بەرائەت وەکو باران
دەڕژێتە نیو جۆگەلەی کۆڵانەکان و
لەگەڵ ( جۆبرکە)کاندا سەما دەکات
سێشەمەیەک /
هەموو
وەرز و کاتژمێرەکان
سوورەت و سەمفۆنیاکان

داستان و ئەفسانەکان
خەون و خۆرەتاوەکان
ئۆقیانووس و ئاسمانەکان
پڕدەبوون له جوانییەکانی سێو
سێشەمەیەک /
مرۆڤ و ماسی و میلۆدییەکان
باڵندە و بەفر و بنارەکان
گەردانە و گەوهەر و گوڵەگەنمەکان
ڕووبار و ڕێڕەو و ڕێگاکان
نەسیم و نیشتیمان و نەورەسەکان
پڕ دەبوون
له تەرزە زێڕینییەکانی زەردەخە
سێشەمەیەک /
ڕووناکی ڕوون ڕوون

بە ڕوونی ئاوێنە
ئاوێنە ڕوون ڕوون
بە ڕوونی ئاو
ئاو ڕوون ڕوون
بە ڕوونی ڕووبار
ڕووبار ڕوون ڕوون
بە ڕوونی ڕەونەقی ئەستێرەکانەوە
سروشت و زەمەن و شەوەکانییان
دەڕازاندەوە
سێشەمەیەک /
ئاگر
لە پەرستگەی ئاتشگەدا
لە سرووتێکی پڕ لە زیکر و سەفادا
بە ڕێنووسە ڕەنگینەکانی ڕاز

قەسیدە درێژەکان و
ئایەتە ئیرۆسییەکان و
ئەفسانەکانی عەشق دەنووسێتەوە
من لەم سێشەمە سوورە سەرمەدییەدا بوو
کە تۆم ناسی ئەی گوڵەباغ

**( پێنج شەمەی مردن )**

پێنج شەمەیەک /
ژیان زمانی خۆشەویستی بیردەچێتەوە
خۆی لەنێو تاریکی لوول دەدات و
وەک نوختەیەکی ڕەش دەردەکەوێت
مرۆڤ دەبێتە مشتێ خۆڵەمێشی

نێو کاسەیەکی کریستاڵی
پەپوولە لە گوڵ
باران لە سەوزایی
گەڵا لە با / نامۆ دەبێ
پێنج شەمەیەک /
ڕووناکی لە سپیدە یاخی دەبێت
سپیدەش لە کات
پەنجەکانم لە من یاخی دەبن
منیش لە جەستە و بوونی خۆم
ئاو لە دەریا یاخی دەبێ و
لەنیو تێنوێتی خۆی
بێ جووڵە ڕادەکشێ
خەون دەبێتە تابلۆیەک پڕ لە وەهم
وەهمیش جەستەی پرسیارەکان و

کتێبە مەعریفییەکان دادەپۆشێ
پێنج شەمەیەک /
مانگ و مانگا و مارمیلکەکان
بێستان و ڕەز و چیاکان
وردە ئەستێرە دوور دوورەکان
گردۆڵکە و زورگ و بنارەکان
دارستان و درەخت و دەریاچەکان
هەر هەموویان دەبن بە تۆز و غوبار
لە شەوێکی ڕەش ڕەشی ڕەشەمێیی
ژنەکان و پشیلەکان
دەست و پەنجە بەخوێن
شاگەشکە و سەرگەردان
بە کۆڵانەکان دەسووڕێنەوە
لە مەکتەب و مزگەوت و کلێساکان

هەر کتێبی جەنگەکان دەخوێندرێ
کەمانجە ژەنەکانیش
سەمفۆنیای تاریکی دەژەنن
پێنج شەمەیەک /
لە ئادەمەوە تا حەوا
لە مۆسۆلۆنییەوە تا مارکس
لە هۆلاکۆوە تا هیتلەر
نابینا و توند توند
توند توند و نابینایانە
بەڕێگاکاندا دەڕۆن
وەک گەردەلوول
بازنە بەدەوری یەکترییەوە دەکێشن
بازنەکانیش تادێت بچووک و بچووکتر دەبنەوە
شوێنپێکان و ڕێگاکانیش ڕەشدەبنەوە
چرا و مۆمەکانیش دەکوژێننەوە

پێنج شەمەیەک /
بەبێدەنگی ژیان بەبەردەمما تێدەپەڕێ
منیش هەر بە بێدەنگییەوە لێی دەڕوانم و هیچیتر
مرۆڤەکان / بە بێدەنگی لەدایکدەبن و دەمرن
عاشقەکان / بە بێدەنگی سەما دەکەن و ونەدەبن
شەپۆلەکان / بە بێدەنگی بەرەو قووڵاییەکان دەچنە خوارەوە
بێدەنگی / دەبێتە شوناسی
بورکانەکان و ڕەشەباکان و تاڤگەکان
بێدەنگی / دەبێتە تایتلی کتێبەکانی ئاگر
خەونەکانیش وەک خاڵخاڵۆکەیەکی مردوو
فڕێدەدرێنە نێو تەنەکەی خۆڵەکان
لەدوای ئەم هەموو بێدەنگییەش
شاعیرێکی ڕۆژهەڵاتی دێت
هەر بە بێدەنگی و
لەنێو کتێبی بێدەنگێدا

بە پێنووسە شینە خۆڵەمێشییەکان
ئەزموونی خۆی دەنووسێتەوە
پێنج شەمەیەک /
بەهار کراسی پایز لەبەر دەکات و
پایزیش ناخی پڕ دەبێت لە بەفر
کاتژمێرەکان دەوەستن
خۆرەتاو لە دووری دوورەوە
دەبێتە گۆمێکی شەختەبەندی شووشەیی
گەردوون دەچێتەوە ناویەک و گرمۆڵە دەبێتەوە
مرۆڤەکان بە ڕووتی لەبەردەم ئەشکەوتەکان
سەری ڕمەکانییان تیژ دەکەنەوە
ڕەنگی گوڵ / دەبێتە هێمایەک بۆ شێتبوون و
بۆنی سێویش / بۆ خنکان و مردن
پێنجشەمەیەک /
هەموو باڵندەکان لەسەر منارەکانی مردن دەنیشنەوە

ڕۆژ بەدەوری ئەستێرەکانی مردن دەسووڕێتەوە
خوداکان تەنها ئایەتەکانی مردن دەنێرنە خوارەوە
حیکایەتخوانەکانیش چیرۆکەکانی مردن دەگێڕنەوە
ڕەوەندییەکان لە بنار کێوەکانی مردن ڕەشماڵەکانییان هەڵدەدەن
لە پێنج شەمەی هەموو
سەدەکان و ساڵەکان و مانگەکان و هەفتەکانیش دا
ژیان ئاوس دەبێتەوە بە مردن
مردنیش ئاوس دەبێت بە ئەبەدییەت
تۆش لەم پێنجشەمە پەمەییەی مردندا
بۆ تاهەتا بەجێتهێشتم
ئەی مرۆڤە نامرادەکەم / فریشتە خانم ... !

**ئۆگستی ٢٠١٩**

# (ماچی لێوەکانی تۆ)

پەیکەری جەستەی من
پڕاوپڕە لە پێکهاتەی دژبەیەک و ناتەبا
بۆ نموونە /
هەندێکجار کاتێک دەمەوێت بخەوم
چاوەکانم نایانەوێت پێڵووەکانییان لێک بنێن
یان کە دەمەوێت شیعرێک بنووسم
پەنجەکانم قەڵەمەکەم ناگرنە دەست
یان کە دەمەوێت بڕۆم بۆ شوێنێک
قاچەکانم بەدوامدا نایەن
یان زۆرجاران دەبینم
دەستێکم ناکۆکە لەگەڵ دەستەکەی ترم
دەمارەکانی ئارەزووم

هەریەکە و لە ئاوازێک دەخوێنن
ژوورەکانی دڵم
یەکێک ڕووناک ئەویتر تاریک
خوێنم هەردەمە و ڕەنگێکە
هەندێکجار
ڕەنگم زەرد و هەندێکجار شین و مۆر و
یان / سوور سوور هەڵدەگەڕێم
وەک ئەوەی / هەموو ڕەنگەکان و ناکۆکییەکانی
وەرزەکان و سروشت و گەردوون
لە مندا کۆبووبێتەوە
بەڵام ئەوکاتانەی
بیری ماچی لێوەکانی تۆ دەکەم
دەمەوێت بێم و لە قوژبنێکا تۆ ببینم
هەموو دەمارەکانی ئارەزووم و چاوەکانم و

پەنجەکانم و دەست و قاچەکانم
هەموو هەموو ...
هەموو پێکرا ڕیز دەبەستن
بە نیگایەکی گەرم و بە خەندەیەکی شیرینەوە
دەڵێن / دەی با بڕۆین ...!

**ئەیلوولی ٢٠١٩**

# (عەشق / ترسناکترین وشەی دۆزەخی)

عەشق / لەنێو سێبەری مردن و
لەنێو بازنە شینەکانی شێتبوون دا
ترسناکترین وشەی دۆزەخی و
بێهوودەترین ڕەنگی لێوەکانی خۆرنشینە
کە / جۆگەلەی ئاگر بەژێر پیتەکانیدا دەڕوات
دارمێویێکە چوار وەرزی ساڵ
هێشوە ترێی تەنیایی دەگرێ
لە نیوان بۆشایی پیتەکاندا
زیندانێکی گەورە هەیە
لە ناوەڕاستی یەکێک لە ژوورەکانیش

پەتێکی ئەستوور هەڵواسراوە
عەشق / خەونەکانی پڕ کردووم لە فۆبیا
چاوەکانم پڕ لە بەفر و
سییەکانیشم پڕ لە با
عەشق / هاواری شەپۆلەکانە
لەناو بێدەنگی سروشتدا
تاڤگەی زەردەخەنەیە
لە لێواری ڕووباری تووڕەبووندا
جەستە تێکشکاوەکەی وەهمە
لەنێو خەیاڵی جەلادێکی دڵ مردوودا
( ع .. ە .. ش .. ق )
ع / عەنکەبووتێکە یەکبەیەک دەمارەکانی عاتیفە
دەقرتێنێ
ە / ئەستێرەیەکە پڕ لە وردە گەڵای نائومێدی و

پڕ لە کولیکە سوورە و حاجیلۆکە قژ زەردەکانی
خۆکوشتن
ش / شەوێکی تەماوی و تاریکە
وەک شەوە ڕەشەکانی بەر لەدایکبوونی خۆرەتاو
ق / قورقوشمێکی ژەهراوییە
بەقوڕگی ژیان دەچێتە خوارەوە
عەشق / ژیان و مردنە لەنێو سەدەفی ڕووناکیدا
مردنی ڕووناکییە لەنێو سەدەفی ژیاندا
ڕووناکی ژیانە لەنێو سەدەفی مردندا
لەگەڵ ئەوەش / سیحراویترین و ئایرۆنیترین
پارادۆکسی ئەم وشەیە
لەوەدایە
گەر عەشق نەبێ
ڕووبارەکان و
درەختەکان و

کاتژمێرەکان / هەموویان دەمرن
شیعریش وەک کچۆڵە نامرادەکان
ئاگر لە جەستەی خۆی بەردەدا
گەر عەشق نەبێ
ئەستێرەکان و
باڵندەکان و
باخچەکان / هەموویان دەمرن
پەپوولەکانیش بێماڵئاوا گوڵەکان لەنێو مەرکانەکاندا
بە تەنیا جێدەهێڵن
گەر عەشق نەبێ
ئاگر و
ئاو و
ئەستێرەکان / هەموویان دەمرن
سپیدەش لە گۆڕستانی نێو دارستانێک دا
لە سەعات بیستوپێنجی مردنی کات

بەدیار مەرگێکی ناکام
هێدی هێدی / بەستە لاوژەییەکانی
دەست پێدەکاتەوە
گەر عەشق نەبێ
ژیان و سروشت و سەوزایی
قەڵەم و شیعر و خەون
دواجار ...
ئێمەش / هەموومان بەیەکەوە دەمرین ...!

سیپتەمبەری ٢٠١٩

# (نیگا)

تۆ خانمێکی خودایت
ڕووناکی و ڕۆحی خودا
لە نێو جەستە و چاوەکانی تۆدان
ئەی ئەگەر نا
چۆن هەر بە یەک نیگا
هەموو غەریزە ئیرۆسییەکان و
هەموو دەمارە عاتیفەییەکانی شاعیرێکت
بە سەما هێنا ...!

# (کۆیلەبوون)

تا ئەوکاتەی
بە ئازادی عەشق نەکەین
هەموومان کۆیلەین ...!

**بەفرانباری ٢٠١٥**

# (بەڵێن)

وەرە بمبە
لە تاراوگەی تەنیایی خۆت
دڵم بکە بە چرایەک
لە گۆشەیەکی ژوورەکەت دامگیرسێنە
یان بمکە بە بوخچەیەک
هەموو / نهێنییەکان و رازە نەدرکاوەکان و
هەموو نامە و خەونە باراناوییەکانی خۆتم تیا هەڵبگرە
منیش بەڵێنت پێ دەدەم
بوخچە داخراوەکانی دڵم
بۆ هیچ کەسێک نەکەمەوە و
تەنانەت لە لای خۆشم نهێنییەکانت نەدرکێنم ...!

**دیسەمبەری ٢٠١٤**

# (کات)

چی دەبێت ئەگەر
زەمەن بگەڕێتەوە دوا
بۆ سەردەمی پێش لە دایکبوونی کات
یان پێش لە دایکبوونی مردنەکان و جەنگەکان
دەمەوێ بزانم لەوێدا
تابلۆکانی عەشق چۆن دەنەخشێنندران
یان ڕەشەبا و زریان بە چ زمانێک
سروود و ئاوازەکانیان دەچڕی

**٢٦ی مارسی ٢٠١٥**

# (زەماوەند)

بە پێچەوانەی هەموو عاشقانی دنیا
کە هاتییە لام
بە ئەسپایی و بێدەنگ مەیێ
ئەمجارەیان
هەموو دەستە خوشکەکان و هاوڕێکانیشت
لەگەڵ خۆتدا بهێنە
فلووت و گیتار و کەمانجەکەشتان بیر نەچێ
دەوەرن دەی ... دەبێ بڕۆین
زەماوەندە لە کۆبانێ ...!

**کۆتایی بەفرانباری ۲۰۱۵**

# من کەرکوکم

من کەرکوکم
دەستەخوشکی کۆبانێم
من هەناسەی کوردستانم
شوناسی چل ملیۆن مرۆڤم
من دەنگی پێنج هەزار شەهیدی هەڵەبجە و
(سەدو هەشتا و دوو هەزار) پەپوولەی ئەنفالم
نە بە داعش و
نە بە هەموو پارێزەرانی دنیای جەهالەت
من ناکەوم ...!

**سەرەتای فێبرووەری ٢٠١٥**

# ناوەکان

ناوی من لەسەر ملی بیابانەکان بنووسە
ناوی پایز لەسەر باڵی کۆترێک
ناوی نیشتیمان لەسەر پشتی شەپۆلێک
ناوی عەشق لەسەر بەرگی کتێبێک
ناوی خۆشت لەسەر دیوارەکانی ماڵی خودا
لێگەڕێ / با من و پایز و نیشتیمان و عەشق
هەر تەنیا و ئاوارە و سەرگەردان بین
خۆشت لە خودا نزیکتر و نزیکتر ببییەوە ...!

کۆتایی بەفرانباری ٢٠١٥

# ونبوون

ئێستا / ڕووبارەکان و ئەستێرەکان و باڵندەکان و
عاشقەکان و ماسییەکان دەنگم نابیستن
ئێستا منیش /
گوێم لە نرکە نرکی ئاگر و
لە گرمە گرمی هەور و
لە زرمەزرمی بروسکە و
لە ورشە ورشی ڕەشەبا و
لە هاواری شەپۆلەکان نییە
ئێستا من کەسێکی ونم
ونم لە نێو / خۆم و دارستانە چڕەکانی ژیان نا
ونم لە نێو نیگا گەرمەکان و
جوانییە سیحراوییەکانی تۆ / ئەی میهرەبان

**دیسەمبەری ٢٠١٤**

# خەونە سوورەکان

خەونەکانی من و
خەونەکانی سەرکردەیەکی کورد
سوور سوورن
سوور سوور سوور
خەونەکانی من
پڕن لە گوڵاڵە سوورەکانی عەشق
خەونەکانی ئەم سەرکردە سیاسییەش
پڕن لە خوێن ...!

# سپییە کوژی

تۆ هەموو ڕۆژێک لە چاوەڕوانی دەمکوژیت و
لەولاوەش پێمدەڵێی خۆشم دەوێی
لەوەتەی هەم لەنێو دڵت زیندانێکت بۆ دروستکردووم
هەمیشەش پێم دەڵێی قوربانی تۆبم من تەنیا هی تۆم
ئەوە چ سپییەکوژییەک و
چ مردنێکی سەبرۆکە و هێواشە ئەم عەشقە ...!

**بەفرانباری ٢٠١٥**

# مەچکۆ

مەچکۆ عادەتێکی سەیری هەیە
یەکجار بچیتە نێوییەوە
یان قومێک لە هەوا دوکەڵاوییەکەی هەڵمژی
وەک نیشتیمان تا ئەبەد
لە زاکیرەت دەمێنێتەوە

فێبروەری ٢٠١٥

# دڵی من

دڵێ من ژوورێکی گەورەیە
پڕاوپڕە لە دەلاقەی جۆراوجۆر
دەلاقەیەکیان /
دەفتەری یادەوەری هەموو برادەرەکانم تیاهەڵگرتووە
دەلاقەیەکی تر بۆ هەموو مرۆڤە عاشقەکان
یەکێکی تر بۆ هەموو مرۆڤە تەنیاکان
یەکێکی تر بۆ شاعیر و نیگارکێشەکان
یەکێکی تر بۆ مرۆڤی سەر شەقامەکان
یەکێکی تر بۆ پەککەوتە و کەمئەندامەکان
یەکێکی تر بۆ هەموو شەهیدە نەبەردەکان
لەسەر دەرگای دڵیشم بە خەتێکی گەورە نووسراوە
ببوورن هیچ جێگایەکمان نییە
بۆ سەرکردە سیاسییە درۆزنە چاو برسییەکان ...!

# خەونێکی شێتانە

گوڵە گیانم من دەمەوێت
هەموو ڕەنگەکانی دنیا لە یەک تابلۆ کۆکەمەوە
هەموو ڕووبارەکانی دنیا بڕژێنمە یەک ئۆقیانووسەوە
هەموو گوڵەکانی دنیا لە یەک باخچەدا بڕوێنم
هەموو عاشقە نامورادەکان و ئەستێرە لە یەکتر دوورەکان و
هەموو باکوور و باشوورەکان بەیەک بگەیەنم
من دەمەوێت ... فریشتە و شەیتانەکان
ڕەش پێست و سپی پێستەکان
بێدین و ئایینزاکان
بەهەشتی و دۆزەخییەکان
هەر هەموو هاودژەکان تەنانەت / مردوو و زیندووەکانیش
لەگەڵ یەکدا ئاشتکەمەوە بەڵکو ئەوە خوایە ئەوانیش ،
من و تۆ لە یەکتری نزیک بکەنەوە ...!

# من و تۆ

تۆ بە رەنگە تۆخەکان
تابلۆی خەونەکانی منداڵیت ڕەنگ دەکەیت و
منیش بە ڕەنگە ئاچوغەکان
تۆ لە وەرزەکانی تەنیایی لە مردن ڕادەکەیت
منیش لە ژیان
تۆ لە تۆران و دڵتەنگییەکاندا
بە زەردەخەنەیەک و گوڵێکی سپی ئاشتم دەکەیتەوە
منیش بە ماچێک و گوڵێکی ڕەش
چ ڕەنگین و ڕەنگاڵە و ڕەونەقاوییە
دنیای من و تۆ

**ناوەڕاستی فێبروەری ٢٠١٥**

# کچێک لە سێو

من ئەمشەو بە بۆنی سێوەوە دەچم بۆ ژووان
لە نێو باغی سێوان کچێک دەبینم و بە نیازە
هەردوو سێوەکانی سەرسینگیم پێ ببەخشێ و
منیش / چەند وردە ماچێک و
ملوانکەیەک لە وردە شیعری عاشقانەی جوان

**١٥ی مارس**

# مۆنالیزای با

له نێو گەردەلوولەکانی مانگی دیسەمبەر
ژنێک هاتە نێو ئاوێنەکانی خەیاڵم
نیگاکانی گەرم گەرم پەنجەکانی سارد
دڵی ڕەق ڕەق مەمکەکانی نەرم
خەونەکانی سپی سپی خەیاڵەکانی ڕەش
منیش ناومنا مۆنالیزای با

**مارسی ٢٠١٥**

# خەونەکانم

خەونەکانی من پڕاوپڕن
لە بارانی نارنجی و ڕووباری سوور
لە بەفری ڕەش و بەهاری زەرد
لە ئەستێرەی شین و هەوری پەمەیی
تۆش تا بۆت دەکرێت دوورکەوە لێم
با زێتر تابلۆی چاو و نیگاکانت
پڕ نەبن لە ڕەنگە نامورادەکانی نامۆیی

# ئیرەیی

لە نێو پەرستگەی شیعرەکانمدا
هێندە باسی
جوانییەکانی جەستە و ئیرۆسییەتی مەمک و
درەوشانەوەی چاوەکانی تۆم کرد
تا هەموو شاژن و حۆری و
مەخلوقە مێیینەکانی نێو بەهەشتی خودا
تەنانەت فریشتە و پەرییەکانی دۆزەخیش
لە داخان هاوارییان لێهەڵسا

**نیسانی ٢٠١٥**

# گەڕانەوە

تۆ ئەشکەوتی ئەستێرە ڕەشەکانت کردووە بە نیشتیمانی خۆت
منیش ماڵە سپییەکانی شیعر
ساڵانێکە بەم هەوارە ڕانابووری
من دەرگای دڵی خۆم بە ڕووتدا داخستووە
دەتوانی بگەڕێیتەوە
وەکو جاران لە نێو شەوە مەستەکانم
لە هەر گۆشەیەک مۆمێک
لە هەیوان و بالکۆنەکانیش چراکان داگیرسێنییەوە

**نیسانی ٢٠١٥**

# من و شیعر

هەر کتێبێک دەخوێنمەوە
بە نیگاری شیعری کۆتایی دێت
هەر دیمەنێک یان ژنێکی جوان دەبینم
پڕم دەکەن لە خەیاڵی شیعری
هەر خەونێک هەر حیکایەتێک هەر فڕینێک
باخچەی ئارەزووەکانم پڕ دەکەن لە لەزەتی شیعری
من وا هەستدەکەم لەنێو منداڵدانی شیعر لەدایکبووم
وەک پەیامبەرێکی شاعیریش
بە بێ شیعر و دوور لە شیعر ناتوانم هەناسە بدەم

نیسانی ٢٠١٥

# پەپوولەی عەشق

زۆر جاران پەپوولەیەک دێتە پەر پەنجەرەکەم
بەدەم باڵە فڕکەوە بە شێوەیەک سەیرم دەکا
کە هەموو غەریزە ڕۆمانسییەکان و دەمارە ئیرۆسییەکانم دێنێتە سەما
وا دەزانم بە هەموو حیکایەتەکانی نێو خەیاڵم دەزانێ
لەوە دەترسم لەلای باران و ئەستێرە و گوڵ و درەخت و فریشتەکان
نهێنی و خەونە نەنووسراوەکانم باس بکا
هەندێجاریش دەڵێم / کێ دەڵێ ئەوە لۆلیتایەک یان پەرییەکی خودا نییە
بەم هەموو جوانی و ناسکییەوە
هاتووە دەیەوێ فێری خۆشەویستی و عەشقم بکا ...؟

**نیسانی ٢٠١٥**

# ڤینۆسە ژن

تۆ شەوەکانم بە ئەستێرەی ڕەش دادەپۆشی
منیش خەونەکانت بە گوڵی سوور
تۆ بە خەیاڵە نامۆییەکانت ژیانم پڕ دەکەی لە نیگەرانی
منیش بە شیعرە پایزییەکانم ڕۆحت پڕدەکەم لە ئاسوودەیی
لەگەڵ ئەوەش /
هێشتا تۆ بۆ من
هەنگوینیترین ژنی دنیای / ئەی ڤینۆسە ژن ...!

نیسانی ٢٠١٥

# نەورەسە ژن

تەنیایی تۆ لە سێبەرم ئاڵاوە و
لێم دوور ناکەوێتەوە
ئەستێرەی بیرەوەرییەکانت
لە شەوەکانم و
خەیاڵە عەبەسییەکانت
لە خەونە خوماریيەکانم جیانابنەوە
تۆ هەمیشە لە کەوتنەکانم هێز و
لە مردنەکانم ژیانم پێدەبەخشییەوە / ئەی نەورەسە ژن

نیسانی ٢٠١٥

# گوڵەباغ

ڕەنگە ناسکەکانی پایز
لە جەستەی من کۆبوونەتەوە و
بەهار ئیرەییم پێدەبات
ڕووناکی خۆرەتاو لە نێو خەونەکانم دەردەکەوێ
شەوەکان ئیرەییم پێدەبەن
جوانی هەموو مرۆڤەکان و فریشتەکان و
باخچەکان و درەختەکان و دەریاکان و
تاڤگەکان و باڵندە و ئەستێرەکانیش
لە تۆدا کۆبوونەتەوە
منیش لە نێو قووڵایی دڵم
ئیرەیی بە تۆ دەبەم ئەی گوڵەباغ ...!

# سەفەر

تۆش مەڕۆ بۆ سەفەر
لەوە دەترسم وەک چۆن سەفەر
منی لە نێو گەردەلوولەکانی دڵی خۆیدا ونکردووە / تۆش ون ببی
وەکچۆن سەفەر
منی تێکەڵ بە هەورە ڕەشەکانی ئاسمانی غوربەت کردووە / تۆش ڕەش ببیەوە
زۆر دەترسم بەرگەی ژانە قووڵەکانی تەنیایی و خەمە خەستەکانی غوربەت نەگریت
هاوڕێم / ئەی میهرەبان تکایە مەڕۆ بۆ سەفەر ...!

# زمان

تۆ بە زمانی دڵ هەموو جەستەم
دەمار بە دەماری هەستە ئیرۆسییەکانم دەلێسیتەوە
پڕم دەکەیت لە لەزەت
دەمگەیەنیتە نێو مەملەکەتی موحیبەت
یان لە نێو گۆڕستانەکانی عەشق زیندووم دەکەیتەوە
منیش بە زمانی شیعر
لە نێو خەڵوەتگەکانی خەون و خەیاڵ
جوانییەکانت دەنووسمەوە
بە شەوە شەونمییە شلێرییەکانت دەسپێرم
لە ئامێزی ئومێدە سوورە سەرمەدییەکان
وەک تریفەی مانگ شەبەنگیانە تا ئەبەد بدرەوشێیەوە

**نیسانی ٢٠١٥**

# ئاوێتەبوون

با ببارێ باران
گەلێک جوانە ئەو دەمانەی
لەگەڵ باران دا دەبارێیت
وەرە بۆلام
دنیایەکی شەونمییە کە دێیتە لام
پڕ بە سییەکانت هەڵم مژە
تابلۆیەکی ئیرۆسییە تێکەڵاوبوون

**نیسانی ٢٠١٥**

# چارەنووس

تەنکە گەڵایەک بووم لە لێوی پایز
گەردەلوول منی گەیاندە
بەردەم دەروازەی دیوەخانی دڵی تۆ
تۆپەڵە بەفرێکی سڕ و سامناک بووم
خۆرەتاو منی ڕژاندە
نێو ڕووباری ڕازە ڕێواسەییەکانی تۆ
عاقیبەت بووم بە بوونەوەرێکی بێهوودە و
عەشقیش منی بەخشیِ بە فیردەوسی جوانییەکانی تۆ

**٣ مەی ٢٠١٥**

# نامۆ

من لە شەوێکی سوور سووری وەک مەمکۆڵەکانی هەنار
بە تۆ ئاشنا بووم
تۆش لە نێو دەفتەری نێو جانتاکەتدا
هەمیشە حیکایەتی
شەوە سپییە سەرابییە سەوداسەرە مەستەکانم بۆ دەنووسییەوە
من لە سەرەتای ڕێگاکە لە تۆ دابڕام
تۆش لە کۆتایی ڕێگاکان چوارپایەکەت لە ئاوریشم بۆ نەخشاندووم
من لە نێو تەنیایی و غەریبی خۆمدا غەرقبووم
تۆش لەنێو ئاوەدانییەکان
شەقام شەقام / گەڕەک گەڕەک / ماڵ بە ماڵ / بەدوامدا دەگەڕێی
چ بەدحاڵیبوونێک و
نامۆ و ناکام و نامورادبوونێکە ئەم عەشقەمان ...!

ئایاری ٢٠١٥

# عەشقێکی ئەبەدی

من هەموو ئێوارانێک
لە خۆم یاخی دەبم
لەگەڵ خۆر ئاوا دەبم و
وندەبم
تۆش هەموو شەوانێک
لە نێو چاوەکانی مانگ دەردەکەوییەوە و
دێیەوە نێو ژیانم

ئایاری ٢٠١٥

# هەنگوین

خواردنەوەی تاڵترین قاوە
بەدەم سەیرکردنی چاوەکانی تۆوە
لەنێو دەمم دەبێتە شیرینیترین هەنگوینی
هەورەمانەکەی لای خۆمان / گوڵەگیان

ئایاری ٢٠١٥

# خاڵخاڵۆکە

وەک خاڵخاڵۆکەیەکی باڵڕەنگین
نەرم نەرم
لە نێو خەونەکانم دەخولێیتەوە
هەمیشەش
خەیاڵەکانم پڕ دەکەی لە خەندەی شیرین

ئایاری ٢٠١٥

## مەوداکان

تۆ لەوسەر دنیا و منیش لەوسەر
ژیان لەودیو کیشوەرەکانە منیش لەوبەر
عەشقیش لە نێو تەمە سپییەکانەوە
کڵاوێکی شینی کردۆتەسەر
هێندەی دەکەم نازانم چۆن
دەستم بە ژیانێک ڕابگات
پڕ بێت لە جوانییەکانی عەشق و
لە نیگا گەرمەکانی تۆ و
ئاسوودە بم هەتاکوسەر...!

ئایاری ٢٠١٥

# داوایەک

تۆ تابلۆیەکی پڕ لە جوانی
پڕ لە سۆز و پڕ لە میهر و پڕ لە نیگا
دەتوانی هەموو شتەکانت ببەخشی بە با
ستیان و سەرپۆشەکەت
مەسکارە و ملوانکەکەت
تکایە ئەی شۆخ بەس دڵی من نا

**ئایاری ٢٠١٥**

# کچە دراوسێ

تۆ لە منداڵییەوە تا ئێستا
هەورێکی شین شینی
شین شین وەک چاوەکانت
خەونێکی سووری
سوور سوور وەک خۆرە ئاوابووەکەی سەر لێوەکانت
هەمیشە لە نێو خەیاڵەکانم دەردەکەوییەوە
وەک مانگی چواردەش دەدرەوشێیەوە

ئایاری ٢٠١٥

# گوڵی خودایی

من گوڵێکم هەیە
تا بۆنی کەم
بۆنی خۆشتر و
تا سەیری کەم
کەشتر و جوانتر دەردەکەوێ
وەک ئەوە وایە
ئەم گوڵە دیارییەکی خوداوەند بێ
لە باخچەکانی ئاسمانەوە بۆم هاتبێ

**ئایاری ٢٠١٥**

# تۆ چیت دەوێ

تۆ دەتەوێ لە ئامێزی با وە
بە نێو قووڵایی گەردەلوولدا ڕەت ببی
یان دەتەوێ لە نێو هەناسەکانی باران
بڕۆیتە نێو مەمکۆڵەکانی ڕووبار
یان لە نێو تابلۆکانی عەشق
خۆت بە ڕەنگە ئاچوغەکانی ژیان
ڕەنگ بکەیت
دە پێم بڵێ گوڵەگیانم
تۆ چیت دەوێ ...؟

**حوزەیرانی ٢٠١٥**

# ڕەقبوونەوە

باڵندەکان / بەسەر دارتەلەکان ڕەقدەبنەوە
مرۆڤە یاخییەکانیش لە نێو بەفر
هەندێکیتر لە ژێر کاری پڕوکێنندا
هەندێکیتر لەبەر مەستبوونەکانییان
هەندێکیشیان لەبەر نیگەرانی و نائومێدییەکانیان
هەندێک لە سەرۆکەکانیش لەبەر خەونە نەرسیستەکانییان
وەک مرۆڤە ئالییەکان / یان وەک پارچە مەعدەنێکی بێ گیان
شان و ملییان بەسەر کورسییەکانیان لار دەبنەوە
قوون و مەچەک و پەنجەکانیشییان
وەک موگناتیس / لە کورسییەکان گیردەبن و لێنابنەوە ..!

حوزەیرانی ٢٠١٥

# تاریکایی تاریکی

من حەزدەکەم
هەرچی تاریکایی و
هەرچی شەوەکانی دنیا هەیە
لە نێو جەستە و لە نێو جاوەکانم
کۆببنەوە
تا ئەوپەڕی تاریکایی تاریکی ببینم و
لەوێدا چرایەک هەڵکەم

حوزەیرانی ٢٠١٥

# هەر تۆ دەبینم

لە نێو شەوە ڕووناکەکانی ڕووناکی
لە نێو سپیدە سپییەکانی سپیدە
لە نێو ئەستێرە سوورەکانی ئەستێرە
لە نێو پێدەشتە پایزییەکانی پایز
لە نێو کێڵگە بەهارییەکانی بەهار / تۆ دەبینم
من لە هەموو شوێنێک هەر تۆ دەبینم

حوزەیرانی ٢٠١٥

# بەردەوامبوون

بۆ ئەوەی تاریکی بناسیت
دەبێ لە خۆرەتاو نزیک ببییەوە
بۆ ئەوەی لە ژیان بەردەوام بیت
دەبێ بەسەر پشتی مەرگدا بازبدەی
بۆ ئەوەی هەتاکو سەر عاشق و یاخی بیت
دەبێ لە سروودەکانی بەرد تێبگەیت

**حوزەیرانی ٢٠١٥**

# من و مانگ و مۆم

تۆ بێدەنگیت بە من بەخشی
تۆ بێدەنگیت بە مانگ بەخشی
تۆ بێدەنگیت بە مۆم بەخشی
من و مانگ و مۆم
بەیەکەوە
هێدی هێدی
لە نێو بێدەنگی تۆ دەتوێینەوە
ڕووناکیش
بە شەوە تاریکەکانی عەشق دەبەخشین

حوزەیرانی ۲۰۱۵

# ئێمە و سەرۆکەکان

ئێمە لە کاتی
هەژاری نەداری و ئیفلاسبوومان
کەلوپەلی ماڵەکامان دەفرۆشین و
هەندێکجاریش کتێبەکامان
سەرۆکەکانیش / نەتەوە و نیشتیمان
ئێمە بۆ لەبیرکردن و بەبادانی
خەم و ئازار و میحنەتەکامان
شەڕابە تاڵەکان دەنۆشین
سەرۆکەکانیش / ڕەنج و خوێنی مرۆڤەکان

حوزەیرانی ٢٠١٥

# دۆزەخ

هێندە سەرسامم بە ئاگر
حەز دەکەم تا ئەبەد
لە نێو دۆزەخ دا بمێنمەوە
بەڵام دۆزەخی خودا نا
دۆزەخی عەشق

**حوزەیرانی ٢٠١٥**

# نهێنی

نازانم نهێنی ئەوە لە چیدایە
ئەوانەی جەستە و دڵ و
نیگا و مەمکەکانیان لە مانگ دەچن
کۆتاییەکانی تەمەنییان
لە نێو تاراوگەی تەنیایی دەبەنەسەر ...!

حوزەیرانی ٢٠١٥

# نائومێدی

ئەستێرەیەکی پرشنگ
لەنێو بەیانییە سپییەکانی چاوی تۆ
خۆرەتاوێکی سوور
لە نێو شەوە تاریکەکانی دڵی من
ژیانیش لە ژوورەوە
دوور لە ئێمە
دەرگای لەسەر خۆی داخستووە

**حوزەیرانی ٢٠١٥**

# ژیان و مردن

ژیانم بە کۆڵ خۆم دادا
شار بە شار کیشوەر بە کیشوەر
دواجار لەسەر ئەستێرەیەکی دوور دوور
لە شوێنێکی تاریک تاریک
جێگایەک دەستی مردنی نەگاتێ
دواتر بینیم هەر ژیان خۆی
هەموو ڕۆژێ چات لەگەڵ مردن دەکات و
جار جارەش
نامەی عاشقانە و ئیرۆسییانەشی بۆ دەنێرێ ...!

**حوزەیرانی ٢٠١٥**

# کۆبانێ و کەرکووک

وەک چۆن
هاژەی تاڤگەکان
گۆرانی ڕووبار
سەمفۆنیای باران
تا سروشت مابێت قەت نابڕێنەوە
(کۆبانێ و کەرکووک)یش
یەکێکیان چاوە و ئەویتریان ڕۆح
تا ژیان مابێت
لە جەستەی کوردان جیانابنەوە

حوزەیرانی ٢٠١٥

# ماچ

دوێنێ لە خەوما
هێندە بە تامەزرۆیی ماچت کردم
لیکی نێو دەمت
نەک هەر جەستە تێنووەکەم
بەڵکو / دارسنەوبەرە سیسبووەکانی
نێو خەیاڵیشمی تەڕ کردەوە

**حوزەیرانی ٢٠١٥**

# بۆنی بێدەنگی

به بێدەنگی
خۆت خزاندە نێو گوڵدانی بیرکردنەوەکانم
بێدەنگیت بەخشی
به ئەستێرەی چاوەکانم
به بروسکەی شیعرەکانم
به سروود و سەمفۆنیاکانم
به تاڤگە و ڕووبارەکانم
به شنەبا و گەردەلوولەکانم
منیش ئێستا وەک تۆ
بۆنی بخوورە شینەکان و
ڕەشە ڕەیحانەکانی بێدەنگیم گرتووە

حوزەیرانی ٢٠١٥

# سترێس

هێندە سترێس و
خەیاڵ  ئاڵۆزم
دەڵێی هەر ئێستا
لە بەهەشت هاتوومەتەوە
لەوێندەرێش
پەردراخە شەڕابێکم
دەست نەکەوتووە بۆ خواردنەوە

تەموزی ٢٠١٥

# شەوە شەختەییەکان

هەرگیز ئەوەم بیرناچێتەوە
کە مەمکە گەرمەکانت
لە شەوە شەختەییە هاوینییەکانم
لە نێو پەرستگەی عەشقێکی ڕووناک
دڵە تاریکەکەم و
پەنجە سارد و سرەکانمی ئارام دەکردنەوە

**تەموزی ٢٠١٥**

# مەرگی شێنەیی

لە دارستانی نیشتیمانی من
بەرانێک قۆچەکانی خۆی لە بن سکی سەوزایی گیرکردووە
پەپوولەکان پۆل پۆل بنار و باخچەکان جێدەهێڵن
چۆلەکەکان چین چین لەسەر شوورەی چیمەنەکان دەنیشنە
پەڕەسێلکەکان پەڕ پەڕ کتێبە زەردەکانی مردن هەڵدەدەنەوە
تەمە سپییەکان تاو تاو بەدەوری لاشەی ئەستێرەکان دەسووڕێنەوە
نەهەنگەکان نەرم نەرم و ناموورادانە ناڵەناڵیانە
ماسییەکانیش مەست مەست سروودەکانی یاخیبوون دەڵێنەوە ...!

**تەموزی ٢٠١٥**

# سەما

من لە تاو ئەم هەموو
جوانییە سیحراوییە ڤینۆسییەی تۆ
لە نێو شیعر و خەیاڵە ئیرۆسییەکانم
وشەکانم هێناوەتە سەما
دیسانەوە سەما
لەگەڵ تۆدا هەموودەم سەما
ئەوە چ جوانییەکی
شەهێنی و شەبەنگی
ڕەنگینی و ڕێواسی
نەخشینی و نێرگزییە / ئەی خودا

تەموزی ٢٠١٥

(.........)

تۆ دەتوانی
لە نێو مەودا دوورەکان دوورترم بکەیتەوە
لە مەملەکەتی غوربەت غەریبترم بکەی
لە نێو دۆزەخی عەشق عاشقترم بکەی
لەنێو وەرزەکانی تەنیایی تەنیاترم بکەی
لە خەونەکانم دوورم کەیتەوە و لە نائومێدیش نزیک

**تەموزی ٢٠١٥**

# عەشقی ڕەش و سپی

من ئەوکاتەی باسی عەشقم لەگەڵ تۆ کرد
بەفرێکی ڕەش لە نێو شەوە سپییەکانەوە دایدەکرد
ئەو کاتەی تۆشم خۆشویست
درەختە سپییەکان لە بەهەشتێکی ڕەش
گەڵاکانییان لە بەهاردا هەڵدەوەری
ئەوکاتەی لە یەکتریش جیابووینەوە
شەپۆلە سپییەکانی نێو ڕووبارە ڕەشەکان
بەدەم گۆرانییەکی حەزینەوە
خۆیان بۆ مردنە سپییەکان ڕووت دەکردەوە
من لە نێو ئەم زەمەنە ڕەشە و
لەنێو خەونە سپییەکانەوە تۆم دۆزییەوە / ئەی گوڵەباخ

# بێزاری

لە کەلوپەلە فڕێدراوەکانی سەر گوفەک
کورسییەک بۆ سەرۆکەکان دروست کەن
لە مەرجان و مۆرییەکانی نێو زێرابەکانیش
ملوانکەیەک بۆ عەشق
لە نێوان دزو جەردە و گەواد و مافیاکان
ژیان چیت بەسەرهات
تۆش چەند بێبەها و
سووک و ڕیسوا بووی ئەی نیشتیمان ..!!

**تەموزی ٢٠١٥**

# نەزیفبوون

له نیشتیمانی من
ژیان نەزیف بووه
خۆرەتاو نەزیف بووه
بەختەوەری نەزیف بووه
مرۆڤایەتی نەزیف بووه
درەختەکان نەزیف بوون
ڕووبارەکان نەزیف بوون
هەموو خوێنییان لەبەر دەڕوا
ئەوه چ چارەنووسێکە ئەی خودا ...؟

ئابی ٢٠١٥

# خۆزگەیەکی پڕ نائومێدی

خۆزگە وەک باڵندەیەک
هەر ئاسمان و ئەستێرەیەک
هەر تەل و لقدادێرک
کەنار هەر چەم و ڕووبارێک
هەر قوژبن و ئەشکەوتێک
ماڵ و نیشتیمانی من با
خۆزگە دونیا بەجۆرێک دروستبا
ئاسوودەیی و بەختەوەری لە کوێ با
مرۆڤەکان و بوونەوەرەکان لەوێندە بووان

ئابی ٢٠١٥

# دووبارەبوونەوە

لە دایکبوونەکان دووبارە دەبنەوە
ئاوێزانبوونەکان دووبارە دەبنەوە
جەنگەکان دووبارە دەبنەوە
مردنەکان دووبارە دەبنەوە
شێتبوونەکان دووبارە دەبنەوە
هەموو شتێک لەم ژیانە دووبارە دەبێتەوە
ژیان لە ڕووبەرێکی هیچەوە هاتۆتە بوون
هیچ و هیچ و هیچ
هەر بۆیە لەنێو بازنەیەکی هیچگەرا
هەموودەم خۆی دووبارە دەکاتەوە ..!

**ئابی ٢٠١٥**

# بەهاری کورد

هاوینێکی سەخت و درێژمان بەڕێکرد
درێژ وەک تەمەنی مرۆڤەکان و ئەشکەوتەکان
پایزێکی درێژمان بەڕێکرد
درێژ وەک تەمەنی خوداکان و کتێبەکان
زستانێکی درێژمان بەڕێکرد
درێژ وەک تەمەنی ئەستێرەکان و دەریاکان
ئێستاش لە چاوەڕوانی بەهاردایین ئەی نیشتیمان

ئابی ٢٠١٥

# فەوزا

دەستی ڕاستم
چاڵ بۆ دەستی چەپم هەڵدەکەنێ
چاوێکم مۆڕە لە ئەویتریان دەکات
پەراسووەکانم هەریەکە و سەر بە درەختێکن
خەونەکانی ئەمڕۆم ئەوانەی دوێنێ بەتاڵدەکەنەوە
ژوورەکانی دڵم هەرشەوەی لانەی کەسێکن
چ زیکرێکی نارێک و
چ فەوزا و وێرانەیەکە ئەم جەستەیەم
لە نێو ئەم ژیانە هیچ و بێنرخەدا
نازانم من بۆ هاتوومەتە دنیا ئەی خودا ...؟

ئابی ٢٠١٥

# ڕۆژێکی ترسناک

منداڵێکی گۆنا خڕپن
بە دەسترازەیەکی سەوزەوە
دایکی لەودیو دەرگاکەوە پێدەکەنی
مانگیش بەکڵاو و پەرچەمی سوورەوە
بۆ گەردەلوولە هارو هاجەکان دەچەمایەوە
چاوەکان و شەوەکان و ئەستێرەکان بێدار مانەوە
درەخت و ڕێگاکانیش لە ئاسمان و تەمە سپییەکانییان دەڕوانی
چ ڕۆژگارێکی ئافاتی و ترسناک و فۆبیایی بوو ئەم زەمەنە ...؟!

**ئابی ٢٠١٥**

# من و ژنێکی کەنەدی

لەگەڵ ژنێکی کەنەدی بووین بە برادەر
ئەو ئۆرگژەنی یەکێک لە کەنیسەکانی نزیک ئیشەکەمان بوو
لە قووڵایی دڵی خۆی باسی مۆسیقای بۆکردم
منیش باسی شیعر ...
ئەو گوتی (من کاتێک مۆسیقا دەژەنم / لە خودا نزیک دەبمەوە و
دنیا ئارامتر و هێمنتر دێتە بەرچاو)
منیش گوتم / (من کاتێک دەچمە نێو خەیاڵە شیعرییەکانم لە خۆم نزیکتر
دەبمەوە و
دنیا ڕەنگینتر و سەوزتر دەردەکەوێ)
بە سەرسامییە بیری لە دوایین قسەکانم کردەوە
بەر لەوەی بڕوات دەستەکانی خستە نێو دەستم
بە زەردەخەنەیەکی گەرمی پڕ لە سۆزی ژنانەوە
گوتی / هۆ شاعیرە ڕۆژهەڵاتییەکە من دەبێ تۆ ببینمەوە ...!

سیپتەمبەری ٢٠١٥

# قەدەر

هەموومان سواری بەلەمێکی ڕەش بووین
بە چارۆگەیەکی دڕاو و بە سەوڵێکی شکاوەوە
لەگەڵ خەوتنی دەریا و ونبوونی شەپۆلەکانەوە
لەگەڵ بێدەنگبوونی ڕەشەبا و بروسکە و هەورە ڕەشەکانەوە
لە نێو ترسێکی ڕەهیبی فۆبیاییەوە
نازانین / لە قەراغ کام کەنارەکانی مردن دەگیرسێینەوە ...!

**سیپتەمبەری ٢٠١٥**

## (ئایلان .. میوانە بچکۆڵانەکەی دەریا)

چەند بە ئارامی خەوتووە میوانە بچکۆڵانەکەی دەریا
تکایە بەخەبەری مەهێنن
ڕەنگە ئێستا خەون بە بووکە شووشەوە ببینێ
یان لەنێو باخچەکانی بەهەشت بەدوای پەپوولەیەک ڕابکا
با زەردەخەنەکەی سەرسیمای نەشێوێ مناڵە بچکۆڵانەکەی فەنا
ئاخ / چ ڕۆژگارێکی سپڵە و چ زەمەنێکی ئافاتییە ..
چارەنووس و ئایندەی مرۆڤ بۆتە پووش و پەڵاش و دراوەتە دەمبا

٣ی سیپتەمبەری ٢٠١٥

# کاڵبوونەوە

باران بەردەوام دەبارێت و
کەچی زەردەخەنەیەک بەسەر
ڕوخساری پنجەگیایەک جێناهێڵێ
ڕووبار بەردەوام گۆرانی دەڵێ و
کەچی موچڕکێک بەجەستە بێدارەکەی درەختێکدا داناهێنێ
گوڵ بەردەوام خۆی ڕووت دەکاتەوە
کەچی دەمارێک لە دەمارە ئیرۆسییەکانی پەپوولەیەک ناجووڵێنێ
وا هەستدەکەم / وەک چۆن من لە نێو بوون کاڵبوومەتەوە
کتێبەکانی عەشق و فیگەری خەونەکانیش هێدی هێدی کاڵدەبنەوە
وەکچۆن ڕەنگەکان لە نێو وەرزی ئومێدەکان کاڵبوونەتەوە
هەموو شتە جوانەکانی ژیان و تەنانەت مرۆڤبوونیش
هێدی هێدی لە بەرچاوان کاڵدەبنەوە ...!

**٩ی سیپتەمبەری ٢٠١٥**

# غوربەت

له غوربەتدا
هەموو دەمەو ئێوارانێک
که خۆر ئاوادەبێت
بەیانییان هەڵنایەتەوە
تادێ گوڵەکان ڕەشتر و
شەوەکان درێژتر دەبنەوە
پەنجەرەکانیش بەڕووی خەونەکان
هەر ناکرێنەوە

**ئۆکتۆبەری ٢٠١٦**

# گوڵە ڕەشەکانی خەون

ڕەشێتی لێوی خۆزگەکانی تۆ و
ڕەشێتی نیگای نائومێدییەکانی من
گوڵی خەونەکانی نیشتیمانیاین ڕەش ڕەش کردووە

**ئۆکتۆبەری ٢٠١٦**

# مەسیجێکی خەمناک

هەر لەم ڕۆژانە
بەرلەوەی ژیان ماڵئاوایی لە نیشتیمان بکا
لە گۆڕستانێکی گەورەدا
لەسەر ڕووی گەڵایەکی زەردی پاییزی
بە ڕێنووسێکی سوور
مەسیجێکی بۆ نیشتیمان جێهێشتبوو
تیایدا نووسیبووی
(نیشتیمانەکەی هەڵەبجە و ئەنفال
تۆ خۆت جەستەیەکی پڕ برین بووی
حەیف نەدەبوو وا برینداراتر و
نائومێدترت بکەن ...!)

ئۆکتۆبەری ٢٠١٥

# ڕێگاکان

با هەموو ڕێگاکان تاقی کەینەوە
ئەو ڕێگایانەی مرۆڤەکان پیایا دەڕۆن و
لە کۆتاییەکەیدا دەگەن بە مردن
ئەو ڕێگایانەی ئیبلیسەکان پیایا دەڕۆن و
لە کۆتاییەکەیدا دەگەن بە بەهەشت
ئەو ڕێگایانەی عاشقەکان پیایا دەڕۆن و
لە کۆتاییەکەیدا دەگەن بە دابڕان
ئەو موسافیرانەی دەڕۆن و ون دەبن
ئەو ئەستێرانەی بۆ تاهەتایە دەکوژێنەوە
ئەو گوڵانەی سیس دەبن و گەشنابنەوە
گوڵەگیانم با بەهەمان ڕێگاوە
بیانگەڕێنینەوە نێو ژیانەوە ...!

ئۆکتۆبەری ٢٠١٦

# بوونێکی گەردوونی

هەموو ژیانم بۆ تۆ
سروشت و ئەستێرەی ئارەزووەکانم
درەخت و باخچەی ئومێدەکانم
باڵندە و پەپوولەی خەیاڵەکانم
بۆ منیش
تەنها تۆ و نیگاکان و زەردەخەنەکانت
گەر تۆم هەبێ
سروشت و ژیان /.باڵندە و ئاسمان
هەموو شتێک هی من دەبێ
نیگاکانت پڕم دەکەن لە بینین
زەردەخەنەکانیشت پڕم دەکەن
لە شیعری جوان و خەونی شیرین
کەواتە من بوونێکی گەردوونیم

# تارمایی

دوێنێ شەو
لە نێو تاریکایی بیرکردنەوە سپییەکانم
ژنێکم بینی
ڕەشتاڵەی چاو سەوزی خوێن گەرم
باڵا شۆخی مەمک قنجی نیگا نەرم
بە زەردەخەنەوە بەرەو ڕووم دەهات
کە زێتر لێم نزیک بوویەوە
جگە لە تارمایی هیچی تر نەبوو
وەک گەڵای دەمبا
بەلامدا تێپەڕی و لەچاوان ونبوو

ئۆکتۆبەری ٢٠١٥

# تۆ هێشتا لە نێو مندا دەژی

تۆ هێشتا لە نێو مندا دەژی
هێشتا وێڵداشەکەت
لە ڕەحمی خەونەکانم جیا نەبۆتەوەو
هەموودەم بەدوای خۆتدا ڕامدەکێشی
کە چاوەکانم لەسەر یەک دادەنێم
لە هەر کوێیەک بیت دەتبینم
لەگەڵ هەر خەم و دڵۆپە فرمێسکێکت ڕادەچلەکێم
لەگەڵ هەر پێکەنین و زەردەخەنەیەکت باڵادەکەم
گەر لە خۆمت جیاکەمەوە
نازانم ئایندەم چی بەسەر دێ
بەڵام لەوە دڵنیام
بە بێ تۆ / ژیانی من کۆتایی دێ ...!

نۆڤەمبەری ٢٠١٥

# مردنی ژیان

یەکێک نیشتیمانەکەی دەفرۆشێ
یەکێکی تر / جەستەی خۆی
یەکێکی تر / کتێبەکانی
یەکەمینییان بۆ کورسی
دووەمینییان  بۆ قوتیە شیرێکی منداڵان
سێیەمینییان  تەنها بۆ توورەگەیەک نان
وەیلۆ وەیلۆ برادەران
لەم ڕەزیلبوون و بێنرخبوونی مرۆڤایەتییەدا
هەر ڕۆژەک
هەر خولەکێک
هەر چرکەیەک / مردنێکە بۆ ژیان ...!

نۆڤەمبەری ٢٠١٥

# ڕۆژەکان

ڕۆژەکان ڕەتدەبن
بێ بزە بێ نیگا
دەڕۆن و ئاوڕ نادەنەوە
نە لە باخچە و باڵندەکان
نە لە نیشتیمان و کاتژمێرەکان
ڕۆژەکان بە تەنیشتمەوە ڕەتدەبن
وەک ئەوەی
نە ئەوان منیان دیتبێ و نە منیش ئەوان

**دیسەمبەری ٢٠١٥**

# گۆڕان

هەموو شتەکان وەک خۆیانن
(پایز ، کات ، باخچە ،
ڕووناکی ، ڕووبار ، عەشق
خەون ، مانگ ، مردن ،
باڵندەکان ، ئەستێرەکان ، ماسییەکان ...)
ئەوەی گۆڕاوە
تەنها مرۆڤەکان خۆیانن ...!

**دیسەمبەری ٢٠١٥**

# نامەی دایکێک

ژنێک لە نامەیەکدا
بێ پێشەکی و بێ پێچ و پەنا بۆی نووسیم
نازانم چی لە وشە ڕەونەقدارەکان و
خەیاڵە ڕۆمانسییەکانی ئێوەی شاعیران بکەم
تۆ پێمان دەڵێی
هێشتا کات ماوە بۆ خەون بینین
ئەم وەرزەش / وەرزی مردنی ئێمە نییە
منیش پێت دەڵێم
تا چاو بڕبکا / ئاسمانی دڵم ڕەش و تاریکە
پارچە نانێکیش لە ماڵەکەمدا نییە
ئەوە تۆ باسی کام خەومان بۆ دەکەی
دە پێمان بڵێ
ئەی کام وەرز / وەرزی مردنی ئێمەیە ...؟!!

بەفرانباری ٢٠١٦

# قەڵەمەکانی دەسەڵات

ئاودەستەکان پڕیەتی لە وشە بۆگەنەکانی ئێوە
زێرابەکان پڕیەتی لە قەڵەمە وشکهەڵاتووەکانی ئێوە
گوفەکەکان پڕیەتی لە کتێبە ڕەنگ زەردەکانی ئێوە
خەون و خەیاڵەکانی ئێوەش
پڕیەتی لە گووی ئاودەستەکان و
لە چڵکاوی نێو زێرابەکان و
لە پاشەڕۆکی سەر گوفەکەکان

بەفرانباری ٢٠١٦

# گەڕانەوە بۆ نێو ژیان

ئێستا ئێمە لە نێو مردندا دەژین
خەونیش بە ژیانەوە دەبینین
باشتر وایە
بگەڕێینەوە بۆ نێو ژیان
لەوێندەرێ
خەون بە دنیایەکی باشتر ببینین ...!

**بەفرانباری ٢٠١٦**

# (گی پی ئێس)

من لە بنەچەی بروسکە و بارانم
لە خۆرهەڵاتی خەونەکانەوە هاتووم
ئێستاش / لە باکووری تەنیاییەوە جێنشینم
گوڵەگیانم / گەر دەتەوێ بمدۆزییەوە
سەیری (گی پی ئێس) ی ناخی خۆت کە و
گوێ لە ترپە و لێدانەکانی دڵت ڕابگرە
ڕاستەڕێ و بەبێ وەستان دەگەیتە ئێرە

بەفرانباری ٢٠١٦

# لە نیشتیمانی من

لە نیشتیمانی من
ژیان بچووک بۆتەوە
بچووک بچووک بچووک
خەونەکان و مرۆڤەکانیش
هێندە بچووک
وەک نوختەیەک ڕەش دەچنەوە
مردنیش تا دێ
وەک ئاسمانە بێسنوورەکان و
وەک دەریایە بێبنەکانێ
بەرین و بەرینتر دەبێتەوە

فێبروەری ٢٠١٦

# ڕەهایی

بیرەوەرییەکانم
لە نێو باخچەی بێئاگاییم
خۆیان دەدەنە بەر باران
هەندێجاریش لێم دوور دەکەونەوە
بە بێ ئەوەی لە ڕۆیشتەکانییان بێزاربن و بکەون
بیرەوەرییەکانم لێم دوور دەکەونەوە
وەک چۆن منیش
لە مرۆڤە بێدەنگەکەی نێو ناخی خۆم و
لە ئارەزوو و خەونەکانم
لە ژیان و نیشتیمانم
دەمێکە دوور کەوتوومەتەوە

**ئاداری ٢٠١٥**

# وەهم

ژیان چ وەهمکی گەورەیە
کاتێک خەونەکان
وەک بالۆنێکی شین
پڕ دەبێ لە هەوای نائومێدی
بۆ نێو هەورە ڕەشەکانی ئاسمان
بەرز دەبێتەوە و
لەوێدا ون دەبێ
یان / بەهای شتە جوانەکان
دەبن بە بلقی سەر ئاو
لە چاوترووکانێک دا
ڕەش دەبنەوە و نامێنن

نیسانی ٢٠١٦

# بێدەنگی

دەکرێ /
هەور و ڕەشەبا
ڕووبار و تاڤگە
جەلاد و خودا
هەر هەموویان بێدەنگ بن
بە بێدەنگی لە دایکبن و
بەبێدەنگیش بمرن
بەڵام قەڵەم نا ...!

نیسانی ٢٠١٦

# دیدار

ئەگەر تەمەن ڕێگە بدات
ئەم دیدارە هەر ڕێکدەخەین
بەرەو بەهەشتە ئەبەدییەکەی عەشق
بەیەکەوە
سەفەر دەکەین
لەژێر ڕەشماڵی موحیبەت
شەڕابی ئەڤینی هەڵدەدەین

جۆزەردانی ٢٠١٦

# سنەوبەرە ژن

تۆم خۆشبوێ یان نا
لێم نزیک بی یان دوور
بێ ویستی خۆم
هەر دەبێ لە نێو
هەوارە بەرزەکانی شیعرەکانم
کەپرێکت بۆ دروست کەم و بتنووسمەوە
چونکە من وەک شاعیرێکی ئەشقیا
بە دوای جوانییەکانی ژیاندا وێڵم
لە هەرکوێ بن
هەوڵدەدەم بیاندۆزمەوە ...!

جۆزەردانی ٢٠١٦

# فەریکە ماچ

ڕوون ڕوون
ڕێگا تاریکەکانی تەنیاییم ڕووناک کەرەوە
ڕۆژ و ڕازەکانم پڕ بکە لە ڕەیحانە
گەرم گەرم
بە فەریکە ماچەکانی
لێوەکان و گەردن و گۆنات
لە بەستەڵەکی بێهوودەییم گەرمم کەرەوە
گۆزەی ئومێدەکانیشم پڕ بکە لە گوڵ و گەوهەر
شل شل
شیلەی ئارەزووەکانت
بەسەر جەستەمدا بڕێژە
بە زەردەخەنە شەبەنگییە شیرینەکانیشت
شاگەشکە و شادومانمکە / ئەی شۆخترین شۆڕەژن ...!

**سەرەتای تەمووزی ٢٠١٦**

# دابڕان

من زۆر جاران حەزدەکەم
قاچەکانم لە بنرا ببڕمەوە
بەتایبەت ئەودەمانەی
کە بەهۆیانەوە
تۆ جێدەهێڵم و
لێت دوور دەکەومەوە

**تەمووزی ٢٠١٦**

# بە بیرم دێ

له منداڵیم وەک گەردەلوول بزێو بووم
پڕبووم لە ڕووناکییه پرشنگییەکانی بەیانییان
له زەردەخەنه زێڕێنییەکانی پایزان
له سەوزاییه سەرمەدییەکانی بەهاران
به بیرم دێ
هەر به پێکەنینەوەش هاتمه نێو ژیان ...!

**بەفرانباری ٢٠١٧**

# دەرگایەک بۆ مردن

تۆ بەر لە ڕۆیشتنت
دەرگای ژوورەکەمت
بە ڕوومدا داخست
دەرگای ئاسمانەکان و
ئەستێرەکان و خەونەکان و
تەنانەت دەرگاکانی سبەینێش
هەموو دەرگاکانت داخست
بەڵام / بۆ مردنم
دەرگای حەوشەی پشتەوەی ماڵەکەمت
خستە سەر گازەرەی پشت ...!

**بەفرانباری ٢٠١٧**

# مردنی مردن

لە نیشتیمانی من
نەک تەنها ژیان
مردنیش دەمرێ
نەک تەنها ڕووناکی
خۆرەتاویش دەمرێ
مرۆڤەکان و دەرەختەکان و باڵندەکان و
باخچەکان و پەپوولەکان و
هەموو زیندەوەرەکان دەمرن
منداڵەکان نا / سەرۆکەکان و جەلادەکان
بۆ خۆشی نا / هەر بەڕاستی بەردییان تێدەگرن ...!

تێبینی : سوود لە شیعری (بۆقەکان) ی ئێریش فرێد وەرگیراوە .

**بەفرانباری ٢٠١٧**

# ناتەبا

سەرەتای ژیان ... گلەیی
کۆتایی ژیان ... گلەیی
مردن ئارامگەیەکی ڕووناکە

سەرەتای خەون ... نائومێدی
کۆتایی خەون ... نائومێدی
عەشق شێتبوونێکی سامناکە

**تەمووزی ٢٠١٦**

# مردنی من

کاتێک کە ژیان دەمرێت / من هەر دەژیم
کاتێک کە عەشق دەمرێت / من هەر دەژیم
کاتێک کە خۆرەتاو دەمرێت / من هەر دەژیم
کاتێک کە سەوزایی دەمرێت / من هەر دەژیم
کاتێک کە جوانی دەمرێت / من هەر دەژیم
بەڵام / کە ئەوکاتەی شیعر دەمرێت
بە بێ هیچ شکوگومانێک منیش دەمرم

**بەفرانباری ٢٠١٧**

# خۆرەتاوێکی تاریک

لەبەر ژانەکانی تەنیای و
ئازارەکانی دووری تۆ
لەم مەملەکەتی غوربەتە
چەندین دیوانە شیعرم
لە سەر لێوی گەڵاکان بۆت نووسیوە و
دڵیشم خۆرەتاوێکی تاریک تاریکە بێ تۆ

**فێبرووەری ٢٠١٧**

# پەیکەری تەنیایی

گوڵەگیانم
دەبێ ئێستا بیر لە چی بکەیتەوە
یان بەسەر کام لە شەقامە پایزییەکانی نائومێدی
پیاسە بکەیت و
نیگاکانت لەسەر کام گوڵی نامۆ گیرسابێتەوە
من ئێستا بە تاقیتەنێ
لەسەر جێگاکەم ڕاکشاوم و بیر لە تۆ دەکەمەوە
وا بە چاوەکانی خەیاڵ و
بە دووربینی وشە ئیرۆسییەکانم / لە تۆ دەڕوانم
لە دووری تۆ وا هەستدەکەم
هەموو تەنیایی دنیا لە ژوورەکەم کۆبۆتەوە و
خۆشم بووم بە پەیکەرێک لە تەنیایی ...!

**فێبروەری ٢٠١٧**

# ئاشتبوونەوە

لە نێو شەوە شێواوەکان و
وەرزە وەنەوزەییەکانی غوربەتم
لە قووڵایی دڵمەوە ئارەزووەکەم
مرۆڤ و ئازادی
نیشتیمان و نان
خودا و خۆرەتاو
تەنیایی و مردن
عەشق و شیعر
لەگەڵ یەکدا ئاشتکەمەوە
ئارەزووەکەم و ئامانجمە
باڵندە و باز
گورگ و مەڕ
جەلاد و قوربانی
لە یەک کانی ئاو بخۆنەوە
ئەوکات منیش
دوا نوختە بۆ قەسیدەی (دەقی تەمەن) م دابنێم و
قەڵەمەکەم بخەمە سەرگیرفان و
بە ئارامی سەربنێمەوە

# تەنیایی گۆشەیەکە لە مردن

چ مردن و کۆچێکە ئەم وەرزە
باڵندە شینەکان کۆچیان کرد
فڕین و فڕین و فڕین
گوڵە شینەکان ژاکان
بێ مەبەست کتوپڕ هەڵوەرین
چ وەرزێکە
ژیان پڕ بووە لە تەنیایی
تەنیاییش پڕ بووە لە مردن
دەریا پڕ بووە لە وشکایی
وشکاییش پڕ بووە لە خەزان

**تەمووزی ٢٠١٦**

## (.......)

خەمی نان
منداڵی لێسەندمەوە
خەونەکانیشم هەموو تەمەنم
عەشق گەنجێتی لێسەندمەوە
تەنیاییش هەموو تەمەنم
نیشتیمان شکۆمەندی لێسەندمەوە
ئازادیش هەموو تەمەنم
خەمی نان و خەون و عەشق و
تەنیایی و نیشتیمان و ئازادیش
گەنجینەیەک پڕ لە شیعرییان پێبەخش

# دەستپێکردنەوە

ئەگەر بۆ تەنها جارێک
ڕاستگۆبین لەگەڵ خۆمان و
زمانی حەز و ئارەزووەکانمان
بهێنینە قسە
هەر لەودەمە /
هەموو یاسا و ڕێساکانی گەردوون
هەڵدەوەشێنەوە
ئێمەش / دەبێ جارێکیتر و سەر لە نوێ
لە سفرەوە دەستپێبکەینەوە

# پرسیار

من هەموو تەمەنم
پڕ بووە لە تەنیایی
تەنیاییشم پڕ بووە لە تۆ
ژیان بەبێ تۆ مردنی لێ دەڕژێ
نازانم /
ئەم دنیایە بۆ هاتۆتە بوون
کە نەزانم لە کوێم و
لە کوێی ئەم گەردوونەش وەستاوم
ئەی / دەبێ ئێستاکە
تۆ لە کوێ بیت گوڵی من ...؟!

# (پەپوولەی ئازادی)

ڕەوە پەپوولەیەکی باڵڕەنگین لە مندایە
خەونەکانمیان پڕکردووە لە خوناو
سروەی شیعرەکانمیان پڕکردووە لە سەما
سروشتی نیگاکانمیان پڕکردووە لە ڕەنگ
تریفەی شەوەکانمیان پڕکردووە لە جوانی
من ناوم ناون پەپوولەکانی ئازادی
هەموو بەیانیانێکیش کە خۆر هەڵدێ
لەهەر کوێیەک / خونچەیەکی لێو تەڕی
نێو هاوار و دەنگی برسییەکانی نیشتیمانم
بۆ نان و بۆ ئازادی و سەرفرازی
چاوهەڵدێنێ و دەپشکوێ
یاغر یاغر نەرم نەرم / دەفڕن بۆ ئەوێ ...!

# (دوکەڵ)

لە نیشتیمانی من
سەرکردە سیاسییەکان
بوون بە بازرگان
وەکو مریشک
هەر یەکە و
لەسەر بیرە نەوتێک هەڵکورماون
کە هەڵدەستن و دەکەونە ڕێ
وەکو مرۆڤی بێ دەرپێ
سووک و چرووک
ڕووت و ڕەجاڵ
دوکەڵێکی ڕەش ڕەشیش
لە کونی پاشەڵیانەوە دەردێ ...!

# گەڕان

لە پڕێکدا وام هەستکرد
دڵم لە قەفەزی سینەمدا نەماوە
گەڕام سووڕام
دواجار
بۆ جێژووانی دواهەمین ژن گەڕامەوە
گوتم وابزانم دڵم لێرەدا بەجێماوە
بزەیەکی بۆ کردم و
یەکێک لە دیوانە شیعرەکانی خۆمی دامەوە دەست
گوتی / دەبڕۆ لە کوێ هاتووی
بە هەمان ڕێگاکەی خۆت بگەڕێوە
تۆ نەک هەر دڵت
هەموو نیگا و
دەمار بە دەماری هەستەکانت
پەڕ بە پەڕی خەونەکانت
تەنانەت / نیشتیمانەکەشت
بە بەرینایی خۆی
لەنێو شیعرەکانتدا پاڵکەوتووە ...!

# زۆنی نیشتیمان

من نە لە زۆنی سەوزم
نە لە زۆنی زەرد
من لە نێو زۆنێکی سپی سپیم
زۆنێک
پڕ لە خەونی گەورە
پڕ لە باخچەی ڕەنگاوڕەنگ
پڕ لە پەپوولەی ئازادی
پڕ لە ئەستێرەی پرشنگ
پڕ لە خۆرەتاوی گەش
پڕ لە سپیدەی ڕوون
پڕ لە شەپۆل و پڕ لە ئاگر
من ل ەنێو ئەم زۆنەدام
لەگەڵ خێڵی
هەژارەکان و چەوساوەکان و برسییەکان
من ئەم زۆنە سپییەم
ناوناوە / زۆنی نیشتیمان ...!

# من ژیانم بۆ شیعر دەوێت

لە کاتی ئەوپەری بێزاربوونم
ئەودەمانەی دەگەمە ترۆپکی نائومێدی
دەڕۆم بەتاقی تەنێ
قاوەیەک لەگەڵ تەنیاییم دەخۆمەوە و
جگەرەیەک لەگەڵ خەمەکانم دەکێشم
بە دەنگێکی نەرمیش
شیعرێکی ناسک / بۆ عەشق نا
بۆ خەونەکانم دەخوێنمەوە
دواتر هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەکێشم و
بەخۆم دەڵێم
تازە بەدوا نوختەی تەنیایی و
بە دوا گۆشە تاریکەکانی غوربەت گەیشتووم
ئیتر چیتر دەبێ با ببێ
خۆ من / ژیانم بۆ شیعر دەوێت ..!

# ئیرەیی

هێندە بەدیار ئاوێنەکە مەوەستە
نەبادا پیاوەکانی نێو ئاوێنەکە
لێت ورد ببنەوە
تێکەڵ بە نیگا گەرمەکانت بن
هێندەش مەڕۆ بۆ دەم ڕووبارەکە
نەبادا ماسییەکانیش
وەکو من / مەست و حەیرانت بن

## (ترێ)

ت / تۆ
ڕ / ڕاز
ێ / ئێواران
گوڵەگیانم .. ئەوڕۆژانە چەند سەرمەدی بوون
کە لەگەڵ تۆدا
هەموو ئێوارانێک ڕازەکانمان دەگۆڕییەوە ...!

**مارسی ٢٠١٩**

# (ئایندەی ئایندەکان)

منداڵیم / لە خانوویەکی قوڕی سەربان گزیری
پەنجەرەیەکی بچکۆڵەی
بەڕووی ئایندەم کردەوە
ئەمڕۆم / لەنێو خەونە ئەرخەوانییەکانم
دەرگایەکی پان و پۆڕی
بۆ ئایندەم خستۆتە سەر گازەرەی پشت
سبەینێشم / ئاسمانێکی پڕ لە وردە خۆرەتاو
دەخاتە بەردەم ئایندەم
دوێنێ شەویش لە تەقسێکی ڕۆشنی تریفەیی
لە ژێر پیرەدار هەنجیرێکی پڕلە ئومێد ڕاکشابووم
بینیم / ئەستێرەیەکی چاو سووری قژ سپی سوخمە شین
لە دوورەوە
نێولەپی کتێبە شیعرییەکانم دەخوێنێتەوە
دواتر گوتی / هۆ شاعیرە ڕۆژهەڵاتییەکە
موژدەت دەمێ
تۆ لەنێو (ئایندەی ئایندەکان) دەژیت و
بۆ تاهەتا دەمێنیتەوە

**ئەپریلی ٢٠١٩**

# (بچووکبوونەوە)

بە قاچەکانی خۆم بە ڕێدا دەڕۆم
بە چاوەکانی تۆ دەڕوانم
هەمیشە بیر لەخۆم دەکەمەوە
خەون بە تۆوە دەبینم
من شیعر بۆ عەشق دەنووسم
تەنیاییش بۆتە نیشتیمانم
بۆیە لای من
ئێستا / ژیان و گەردوون
لە سفرێکی دوای فاریزە
بچووک و بچووکتر بۆتەوە ...!

## (خەون)

دوێنێ شەو لە خەومدا
لەنێو خەیاڵێکی قووڵی بێ سەروبن
بە ڕێگایەک دا دەڕۆیشتم
هیلاک ماندوو
تێکشکاو و هەنجن هەنجن
لە پڕێکدا
لەژێر ڕەشماڵێکی ڕزیوی کون کون
ژیانم بینی
بە زەردەخەنەیەکی سترێسئامێزەوە
سڵاوی لێکردم و گوتی
هۆ شاعیرە ڕۆژهەڵاتییەکە
دڵتەنگ مەبە
منیش / وەک نیشتیمانە بریندارەکەی تۆ
ئاوسم بە مردن

# (من و شیعر)

شیعر نزیکە لەمن
وەکو خۆم
بۆیە هەر کەسێ
دەیەوێت
لە بوون و نهێنییەکانم تێبگا
یان بییەوێت من بناسێ
با بچێ
قووڵ قووڵ
لە چاوی شیعرەکانم بڕوانێ

**تەمووزی ٢٠١٩**

## (بەرەو کوێ)

لەم دوای نێوەڕۆیە گەرمەی خەیاڵم
لە ڕەنگەکانی ئاسمان و لە دڵتەنگی با تێناگەم
لە هەناسە سواربوونی ڕووناکی و لە زەردەخەنەکانی پایز تێناگەم
من بەرەو کوێ دەڕۆم ئەی عەشق
کە نیشتیمانم ڕۆژ لەدوای ڕۆژ برینەکانی قووڵترو قووڵتر ببنەوە
یان /
خاک و خۆرەتاو
باران و گیا
گوڵ و پەپوولە
ڕۆژ لەدوای ڕۆژ / مەوداکانی نێوانیان دوورتر و دوورتر ببنەوە ... !

**تەمووزی ٢٠١٩**

# (من ڕۆژئاوام)

من ڕۆژئاوام
هانێ ئەوە دەستم
تاقە ڕێگای مانەوەمان بەس یەکبوونە
گەر ناسیۆنالیستێکی نیشتیمانپەروەری / دەستت بێنە
گەر کۆمۆنیستێکی مرۆڤپەروەری / دەستت بێنە
گەر ئایینزادەیەکی هەقپەروەری / دەستت بێنە
ئەگەر فەلەی یان زەردەشتی یان کاکەیی یان یەزیدی
لە باشوور بی یان لە باکوور یان ڕۆژهەڵات
لە هەر کوێیەکی ئەم دنیایەی / دەستت بێنە
من ڕۆژئاوام
جەستەم پڕ لە برین و
جەرگ و دڵیشم ڕووباری خوێنە
دەستت بێنە
تەنها تاوانم کوردبوونە و هیچیتر ...!

# (خۆرەتاوێکی نوێ)

هیچکاتیک درەنگ نییە بۆ هاتنت
هەموو چرکەکانی شەوانی تۆ
هێشووە ترێی یەکەمین ماچیان پێوەیە
هەر کە هاتی / ئەم غوربەتە جێدەهێڵین و دەڕۆینەوە
ئەمجارەیان لەنێو چلە زەیتوونەکانی ڕۆژئاوا
بارگە و هەوارمان هەڵدەدەین چونکە لەوێ
مژدە و پرشنگی خۆرەتاوێکی نوێ / بەرێوەیە

# شیعری ١٣

له شەقامی سیانزەی
شاری عەشق
له باڵەخانەی سیانزەهەمینەوە / سەرکەوە
لەبەردەم دەرگای ئاپارتمانی سیانزەهەمین
سیانزە چرکە بوەستە و
بێ دەرگا لێدان بڕۆ ژوورەوە
لەوێدا /
شاعیرێک سیانزە ساڵە
له چاوەڕوانیت
تیشکە شەبەنگییەکانی شەو دەژمێرێ

جولای ٢٠٢٠

# نەفرەت

کە دەبینم
نووسەرێکی کۆیلە / باس لە ئازادی و
جەلادێک / باس لە عەشق و
سیاسییە بازرگانێکی گەندەڵ / باس لە چاکسازی و
گوتار بێژێکی ئیسلامگەرای تووڕە / باس لە ماف و دادپەروەری و
پێشمەرگەیەکی ماندووش / باس لە
کێشەی شیری منداڵەکەیی و کرێی خانووەکەی دەکا
ئیتر لەودەمەدا / پەنجەکان و زمانم سڕ دەبن
هیچم پێ نامێنێ بۆ نووسین و بۆ گوتن
هێندە نەبێ لەنێو قووڵایی هەناسەی نەفرەتێکەوە / دەڵێم
ئای چەندە غەریب و چ وێرانەیەکی زەمانەی / ئەی نیشتیمان

**ئاياری ٢٠٢١**

